وَاعْتَصِمُواْ بِحَبْلِ اللّهِ جَمِيعًا وَلاَ تَفَرَّقُواْ

# هۆی پشێوی و نا تەبایی موسوڵمانانی ئەمڕۆ دەگەڕێنیتەوە بۆ چی؟

## کۆمەڵێک ئامۆژگاری و بیرخستنەوە لە سەر زاری مامۆستایان و بانگخوازانی ئیسلامەوە

**ئامادەکردنی: باوکی ئەسماء**

**بسم اللهالرحمن الرحيم**

**الحمد لله رب العالمين الصلاة والسلام على قا ئد المرسلين نبيينا وحبيبنا و شفيعنا محمد(صلى اللهعليه وسلم) وعلى الهوأصحابهومن تبعهم  بإ حسان إلى يوم الدين. أما بعد**

**سه رەتا و پێشەکیەک بۆ چوونە نێو ڕێڕە وی باسەکە:**

بەم شێوەیە دەستمان پێکرد

**بانگەواز بۆ ڕاپرسی؟**

ئاگاداری سەرجەم ئەندامان وخوێنەرانی بەڕێزی ماڵپەڕی باوکی ئەسماء دەکەین کەوا لە دەستی چەپی کۆمپیوتەرەکەت دا ڕاپرسییەکمان ئەنجام داوە لە لاپەڕەی دەسپێکی سایتەکەدا سەبارەت بە هۆکاری لاوازبوونی مسوڵمانان وهۆی پشێوی و نا تەبایی مسوڵمانانی ئەمڕۆ دەگەڕێنیتەوە بۆ چی؟

بەڕێزیشت ئەوخاڵەی کە بەلاتەوە گرنگە کلیک بکە تاوەکو لەسەر ئەم ڕاپرسییە ڕاپۆرتێکی گرنگ لەسەر ڕاپرسییەکە بنوسین بەڵکو إن شاألله بە هەموومانەوە بتوانین ئەو بۆشاییە گەورەیە ی نێو ڕابونی ئیسلامی پڕبکەینەوە و بزانین کێن و چین ئەو شتانەی کە بوونەتە هۆی ئەم پشێوییە؟ ئەگەرچی ئەو چوار بۆچوونەی کە هەڵمان بژاردوە هەموویان کاریگەری خۆیان هەیە لەسەر ڕەوشەکە بەڵام دەبێت خاڵێکییان لە هەمووان گرنگ تر بێت!

تێبینی: ئەم ڕاپرسییە لە بەرواری 4/4 ی 2010 ەوە دەست پێدەکات وە بەردەوام دەبێت تاوەکو 2010/5/1 بەو هیوایەی هەرکەسەو لە ئاستی خۆیەوە بە بێ چاو نوقاندن بەڵکو بەوپەری بیرکردنەوەودڵسۆزیت بۆ ڕابونی ئیسلامیی ئەم ڕاپرسییە هەڵبژێرەو ئەوجا ئەنجامی بدە.

بەڵێ خوێنەرانی بەڕێز لە پاش ئەوەی ئەم لینکە بەدرێژایی مانگەکە

خوێنەرێکی زۆری هەبوو وە هەرکەسەو لە ئاستی خۆی و لە لای خۆیەوە بە بیرو بۆچوونی خۆی دەنگی دا بۆ یەکێک لەو چوار خاڵەی کە هەڵمان بژاردبوو بۆ ڕاپرسییەکە وە بێ لە ماڵپەڕە کەی خۆم  برایانی ماڵپەڕی کاک هێمن کەلاری و ماڵپەڕی قەڵای ئیسلامیش بەو پەڕی دڵخۆشی یەوە لقێک لە ڕاپرسییەکەیان لە نێو ماڵپەڕی خۆیان دا بڵاو کردەوە تاوەکو خەڵکێکی زۆرتر لە راپرسییەکەدا بەشدار بێت و خوای گەورە پاداشتی خێری ئەوانیش بداتەوە بۆ ماندوو بوون و یارمەتی دانم سوپاس بۆ خوای گەورە بەسەرکەوتویی کۆتایی هات.

## ئەنجامی کۆتایی راپرسی




یەکەم: نەگێڕانەوەی کارەکان بۆ قورئان و سووننەت 61 %
دووەم: نەبوونی پێشەوای ڕاستگۆ 26 %
سێیەم: نەبوونی زانیاری شەرعی 8 %
چوارەم: نەبوونی تاکی مسوڵمان 5 %

پاش ئەوەی کۆمەڵێک ڕاو سەرنجی تایبەتیمان بۆ درووست بو لەسەر ڕاپرسییەکە کە کۆمەڵێک لە مسوڵمانان پێیان وابوو تە نییا ئەم چوار خاڵە هۆ کار نین بۆ پشێوی و ناتەبایی نێو خۆی مسوڵمانان! لە بەر ئەو خاڵەو چەندین هۆکاری تر بە پێویستم زانی کە دەست بکەم بە ناردنی کۆمەڵێک نامەی تایبەتی لە ڕێی ئیمەیڵی تایبەتییەوە بۆ کۆمەڵێکی زۆرلە مامۆستایان و بانگخوازان و سەرکردەی هەر سێ لایەنی ئیسلامی نێو ساحەی کوردستان و برایانی سەلەفی لەڕێی ئیمەیڵی ماڵپەڕە کانییانەوە ئەگەر چیش بە هۆی مەشغەڵەت و عوزرەوە لە لایەن سەرکردەی لایەنە ئیسلامییەکانەوە وەڵاممان نەدراوەتەوە ! گرنگ ئەوەیە کە هەر یەکێک لەو سەرکردانە ی کە ئەم ڕاپرسییەی خراوەتە بەردەست بتوانێت سوود وەربگرێت لەم بیر خستنەوانە و بە هەڵەکانی خۆیان دا بچنەوە و لێپرسینەوەیەک لە نەفسی خۆیان بکەن پێش ئەوەی لێپرسینەوەیان لێبکرێت وە لەهەوڵی سەرخستنی دینەکەی خوای گەورەدا بن نەک جێ بەجێ کردنی هەواو ئارەزووکانییان کە ئومێد دەکەین ئەوان دوور بن لێی إن شاألله، بەڵام پاش ئەمەش هێشتا هەستم دەکرد کە ئەم کارە کەم و کوڕی تێدا ماوە بۆیە پاش بیر کردنەوەم هەستام بە پەیوەندی کردن بە کۆمەڵێک برای بەڕێزەوە لە کوردستان کە بتوانن لە گەڵ چەند مامۆستایەکی بەڕێزدا چاوپێکەوتن بکەن و ئەم ڕاپرسییە بخەنە بەردەستییان وێڕای دەست خۆشی و دوعای خێرم بۆ هەموو ئەو برا بە ڕێزانەی کە یارمەتییان دام زۆر بە لێهاتووی کەوتنە خۆ و چوونە خزمەتی چەند مامۆستایەکی بەڕێزو ڕاپرسییەکەیان خستە بەردەستییان و وە ئەو مامۆستایەی کە کاتی هەبووبێت بە پێی توانا وەڵامییان داوینەتەوە خوای گەورە لە وان و ئێمەش ڕازی بێت و ئومێد دەکەین هەرکەسەو لە ئاستی خۆی بە خوێندنەوەی ئەم ڕاپۆرتە گرنگە و سەرنج و ووتەی مامۆستایان و بانگخوازانی ئیسلام بەهەڵەکانی خۆمان دا بچینەوەو بەڕاستی خەم خۆری ئاینەکەی بین، لە کۆتاییدا داواکارم لە خوای گەورە کە پاداشتی خێری هەموو ئەو مامۆستاو بانگخوازو برا

بەڕێزانەم بداتەوە کە یارمەتی دەرم بوون لە ئامادەکردنی ئەم پەرتوکەدا و خوای گەورە دڵەکانمان پڕ بکات لە نوری خۆی و پابەندمان بکات بە قورئان و سووننە تەوەو وە هەموو لەهەوڵی ئەوەدا بین کە کارەکانمان بگێڕینەوە بۆ سەرچاوەی قورئان و سووننەت چوونکە بەراستی تە نییا دەست گرتن بە قورئان و سووننەتەوە دە توانین چارەسەری ئەم دەردە کووشندەیە بکەین کە ڕیزەکانی مسوڵمانان ڕێک و پێک بکەینەوە ئەگەر وامان کرد ئەوە دڵنییا بن کە خوا یارمەتی دەرە بەڵام ئەگەر هەر وا بمێنینەوە مەگەر خوا بەزەیی پێمان دا بێتەوە ئەگینا خوای گەورە زیاتر توشی تاقی کردنەوەو بەڵاو ناڕەحەتیمان دەکات  هەروەک چۆن گەلەکانی پێش ئێمەشی  تاقی کردۆتەوە ! .

خوای گەورە دڵەکانمان یەک بخاتەوە(اللهم آمین)

تێبینی:

1. ئەم ڕاپرسی یە لە گەڵ کۆمەڵێکی زۆر لە مامۆستایان و بانگخوازانی ناوەوەو دەرەوەی کوردستان ئەنجام دراوە بە بێ دەمارگیری بۆ کەس و لایەنێک لە هەموو چین و توێژێکی ئیسلامی تێدایە هەر لە مامۆستایانی(سەلەفی،صۆفی،یەکگرتو،کۆمەڵ،بزوتنەوە، بێلایەن...)تا کۆتایی..
2. مەرج نی یە ڕاوبۆچونمان لەگەڵ هەموو ئەم وەڵامانەدا یەک بگرێتەوە و بەپێچەوانەشەوە سوودمەند بووین لە ووتەی ئەم کۆمەڵە زاناو بانگخوازە بۆ ئەنجام دانی کاری شەرعیمان لەداهاتوودا إن شاألله.

**باوکی ئەسماء**

8 **جمادى الأخر**, 1431

2010/5/22

## سەرەتا ڕاو بۆ چوونی باوکی ئەسماء لەسەر بیرۆکەی ئەم ڕاپرسییە؟

**بۆچی ئەو چوار خاڵەم هەڵبژارد؟**

پاش سوپاس و ستایشی بێ پایانم بۆخوای گەورە و بێ هاوتا سەڵاواتی خوای گەورە لەسەر پێغەمبەری کۆتازەمان محمد(صلى الله عليه وسلم) و یارو یاوەرانی بەڕێزی بێت، پاش ئەوەی لە بەرواری 4/4 ی2010 وە وەک خەمخۆرێکی ئیسلام و مسوڵمانان لە پاش هەست کردنم بەو دووبەرەکی و پشێوی و ناتە باییە ی کە ئەمڕۆکە مسوڵمانانی پێدا تێدەپەڕن، لەو ڕوانگەیەوە بە پێویستم زانی ڕاپرسییەکی گرنگ سەبارەت بەو ڕەوشە نالە بارو ناهەمووارە لە ماڵپەڕەکەم دا ئەنجام بدەم ، سەرەتا بە پێی بۆ چوونی خۆم هۆکانم بۆ ئەم چوارە خاڵە گەڕاندەوە:

1. **نەبوونی پێشەوای ڕاستگۆ**:

ئەگەر بەووردی سەرنج بدەینە ژیانی پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لە رابردوودا وەک پێشەنگێکی ڕاستگۆو خەم خۆری ئوممەتەکەی هەرگیزاو هەرگیز حەزو ئارەزوو بەرژەوەندییەکانی تاکە کەسی خۆی نەخستۆتە پێش هاوەڵانی بەڕێزی لەگەڵ هەموو غەم و ناسۆرێکی هاوەڵانی دا بوو، لەگەڵیان برسی و تینوو ئازارو دەربەدەری ونارەحەتی دە بینی و تە نییا لە خۆشی یەکاندا لە گەڵ هاوەڵانی دا نەبوو بەڵکو لە زۆربەی جەنگەکانیش دا خۆی بە گیانێکی خۆبەخت کارانەو چاو نەترسانەوە لە پێناوی خوای گەورە و پاشان سەرخستنی پەیامەکەی بەرگری دەکرد لە پێش هاوەڵانی یەوە و سەرکردایە تی جەنگەکەی دەکرد، بەڕاستی من هەرشتێک باس کەم لەسەر ژیانی ئەم پێغەمبەرە ڕاستگۆیە(صلى الله عليه وسلم) ئەوەندەی کە بچووک دەبمەوە لە ئاستی ئەو سەرووەریە پڕ بایەخانەی کە ئێستاش مسوڵمانان شانازی پێوە دەکەن تا مردنیش هەر جێی شانازی یەو لە پاش زیندوو بوونەوەش هەرجێی شانازیی یەو لە بەهەشتیش دا هەر جێی شانازی یە ، لێرەدا لەوانەیە کەسێک پرسیار بکات بڵێ : ئەوە پێغەمبەری

خوابووا!(صلى الله عليه وسلم) بابه کێ دەگاتە ئەو ئاستە! منیش دەڵێم: ڕاستە کەس ناتوانێت بە وێنەی ئەو پێشەوایەتی بکات، بەڵام خۆ ئەو کەسەی کە دەبێتە پێشەوای کۆمەڵێک دەتوانێت شێوازوهەڵس و کەوتی ئەم پێغەمبەرە پایە بەرزە بگرێتە بەر (صلى الله عليه وسلم) وە خەم خۆری ڕاستەقینە بێت لە گەڵ ڕەعیەتەکەیدا! ئەی مەگەرنموونەی وەک ئیمامی عومەری کوڕی خەطاب و عومەری کوڕی عبدالعزیز و، ، ، تا صەلاحەدینی باوە گەورەمان و چەندین کەڵە پیاوی کەی ئەم زەمانە و ئەم چەرخە، وەک دکتۆر عبدالله عزام و مامۆستا مە لا عثمان عبد العزیز و چەندینی تر (ڕەزاو ڕەحمەتی خوایان لێبێت) کە لە خزمەتی ئەم ئاینە پیرۆزەدا گیانییان بەخت کردوو بە سەری بەرزەوە گەڕانەوە لای خوای گەورە ئایا ئەوانیش هەر وەک ئێمە مرۆڤێکی ئاسایی نە بوون؟ بەڵام ئەی بە چی گەشتنە ئەو ئاستە ی کەخوای گەورە لەسەر دەستییان دا کۆمەڵێک دڵی زۆر ڕزگار بکات و لە ئاگری دۆزەخ بۆ بەهەشتی پان و بەرین وە پاشان لەژێر بەیداخێکدا کۆیان کەنەوەو دینەکەشییان پێ سەربخات؟ مەگەر لە ڕووکەش دا ئیخلاسی و ڕاستگۆیەتییان نەبوو بۆ دینەکەی خوا؟ هەڵبەت ناوەڕۆکیشیش لای خوای گەورەیە و ئەو زانایە بە نهێنی دڵەکان، وە ئایا مەگەر لێبڕانی تەواوەتییان نەبوو بۆ دینەکە؟ ئەی ئێستا کام لە پێشەواکانی مسوڵمانان نموونەی ڕاستگۆیی ئەو کەڵە پیاوانەی لە خۆی دا درەوشاندۆتەوە وەک ئەندامانی سادەی کۆمەڵەکەی ژیان دەباتە سەر؟وە کێ یە ڕاستگۆ لەگەڵ شوێنکەوتووانی؟ وە کێ یە کە لە ناڕەحەتی و ناسۆری مسوڵمانان دەپرسێتەوە؟ ئا لەم زەمەنی غوربەتەدا؟ کە بێ شوان و بێ ڕابەر کەوتووین هەرکەسەو لای خۆیەوە هاوار دەکات ئەوە منم ڕزگارکەرو شوانی ڕاستەقینە! بەڵام زۆر بەداخەوە کاتی خۆی ئەوانە پیاوی ئەم ئیسلامە بوون و ئێستاش ئێمەین پیاوی ئیسلام بۆیە ڕۆژمان گەشتوە بەم ڕۆژە ، پێشەواکانی ئەم سەردەمە ئەوەندەی لەهەوڵی سەرخستنی فکرەکانی خۆیان دان ئەگەر بەڕاستی لەهەوڵی سەرخستنی

پەیامە ئاسمانییەکەی خوای گەورەدا بونایە ئەوا بێگومان خوای گەورە
خۆی دڵی مسولمانانیشی یەک لایی دەکردەوە بەلایان دا ،ئەگەر چیش
ئەمە بەڵێنی خوای گەورە خۆیەتی کە دووبەرەکی دەمێنێت لە نێو
مسوڵمانان دا بەڵام بینیومانە هەر کۆمەڵێک ڕاستییان کرد بێت لە گەڵ
خوای گەورەداو پێشەوایەکی ڕاستگۆیان هەبووبێت ئەوا خوای گەورە
پشتی دووژمنەکەی شکاندوون و نە ی هێشتووە زاڵبن بەسەریاندا مەگەر
ناکۆکی نێو خۆیان لە ناوی بردبێتن، کەوابوو پێشەوا دەورێکی
کاریگەری هەیە لە سەرکردایەتی کردنی مسوڵمانان داو دەبێت نییەتی بۆ
خوای گەورە یەک لای کردبێتەوەو ڕاستگۆ بێت لەگەڵ ڕەعیەتەکەی دا لە
پێش کۆمە ڵەکەیەوە بێت لە ناسۆرو خەمی مسوڵمانان دا و ڕەعیەتەکەی
بەکار نەهێنێت لە حەزو ئارەزووەکانی خۆی دا و تە نییا و تەنییا
نییەتی رەزامەندی خوای گەورە بێت و هەستی لێپرسراوییەتی دواڕۆژ لە
بیر نەکات، بیری بێت ئەگەر لێپرسراوی 10 کەسیش بێت بەکەلەپچە
دەچێتەوە بەربارەگای خوا،جیاوازی نەخاتە نێو ئەندامەکانی و
داپەروەربێت نەک کامییان زۆرتر بەرژەوەندییەکانی ئەو قبوڵ دەکات لە
پێش بێت و کامیشییان ڕەخنە یان هەڵەی بۆ راست بکاتەوە پەراوێزی
بخات چونکە دواتر خوای گەورە ئەویش پەراوێز دەخات و لە بیری
دەکات و شکستی بەسەردا دەهێنێت هەربۆیە دەبینین لە ڕاپرسی یەکەدا
نە بوونی پێشەوای ڕاستگۆ خۆی لە پلەی دووەم دا دەبینێت بە جۆرێک
کە لە % 26 ی دەنگدەران پێیان وایە ئەمە یەکێکە لە هۆکارەکان.

2.**نەبوونی تاکی مسوڵمان**:

بەڕاستی یەکێکی تر لەو گرفتانەی تری ڕەوشی مسوڵمانان نەبوونی
تاکی مسوڵمانە، نەک بەو مانایەی کە مسوڵمانان ڕێژەیان کەم بێت
بەڵکو مەبەستمان ئەوەیە کە جاری واهەیە پێشەوا هەیە و خەڵکیش
زۆرە بەڵام تاکی مسوڵمان وەک پێویست یارمەتیدەری پێشەواکەی نییە
جاری واهەیە پێشەوا بە هۆی سەرقاڵی بە بانگەوازو ڕاپەڕاندنی کاری
مسوڵمانانەوە توانای ئەوەی نامێنێت کە کاریش بکات و پێشەوایەتیش

بکات یان ئەگەر هەر خەریکی کار بێت ئەوا حەقی تەواو نادات بە پێشەوایەتییەکەی، کەچی بە پێچەوانەشەوە تاکی مسوڵمان هەست بە ناسۆری پێشەواکەی ناکات و ڕۆژێک لە ڕۆژان ئامادەی یارمەتی دانی نییە چی لە ڕووی مادی یان مەعنەوی و یان بەدەمەوە چوونی پێشەوا لە ڕاپەڕاندنی ئیش و کاری مسوڵمانان دا ، چاوەڕاونی ئەوە دەکات داوای لێبکرێت ئەوجا کارێک ڕاپەڕێنێت، یان جاری واش هەیە پێشەواش کارێکی دەدات بەسەردا بە بەڵگەی ئەوەی کە ئەو توانای ئەو کارەی نییە یان زۆری ماوە بگاتە ئەو ئاستە دەکەوێتە سەرپێچی پێشەواکەیەوە خوا پە نامان بدات، وە هەروەها ڕۆژێک لە ڕۆژان بیر لەوە ناکەتەوە کە ئەم بچێتە پێش لە پێشەواو وە ک هاوەڵانی پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) بڵێت : ئەوە ماڵ و گیانم فیدایە لەو ڕێگە پیرۆزەدا کە گرتوتە بەر کە مەبەستمان پێی (ئاینی پیرۆزی ئیسلامە) تاوەکو پێشەواکەی زیاتر دڵخۆش و شادمان بکات هەر وەک چۆن هاوەلانی ئەنصار خوایان لێ ڕازیبێت کاتێک پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ویستی ڕایان بزانێت لە جەنگی بەدردا دوای دووبارەکردنەوەی ئەم ووتەیە کە فەرمووی: (خەلکینە ڕای خۆتانم پێ بڵێن مەبەستی ئەنسارییەکان بوو ئیتر(سعدی کوڕی معاذ) خوای لێ ڕازیبێت سەرکردەو ئاڵا هەڵگری ئەنسارییەکان هەستی پێکرد کە مەبەستی پێی ئەوانە، ووتی: وەڵاهی دەڵێی مەبەستی ئێمەیە پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی بەڵێ، سعد فەرمووی: ئێمە باوەڕمان پێت هێناوە،متمانەمان پێداویت،شایەتیمان داوە ئەوەی تۆ هێناوتە ڕاستیە ، لەسەر ئەو بنەمایە پەیمان و بەڵێنمان داوە کە گوێڕایەڵیت بین پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)، بڕۆ بۆ ئەو مەبەستە خۆت دەتەوێت، سوێندم بەوەی تۆی بەهەق ناردووە ، بمان دەیت بەگژ ئەودەریایەدا لەگەڵت دا دێین و، یەک پیاومان دواناکەوێت و ناترسین لەوەی سبەینێ بچین بەگژ دووژمن دائێمە لەم جەنگەدا دان بەخۆدا دەگرین، ڕاستگۆین لە ڕووبەڕووبوونەوەدا ، بەڵکو خوای گەورە بە هۆی ئێمەوە شتێکت پیشان بدات کە دڵ و چاوتی پێ دڵخۆش بکات ،

بمان خەرە ڕێ لەسەر بەرەکەتی خوا) ئەمە لە کاتێکدا بوو کە لە پەیمانی عەقەبەکان دا باسی ئەوەی تێدا نەبو کە لەدەرەوەی شاری مەدینە پشتیوانی لە پێغەمبەری خوا بکەن(صلى الله عليه وسلم) هەر بۆیە لەم ڕۆدا دەبینین پێشەوایش زۆر جار لە بێ هەڵوێستی تاکی مسوڵمان دا بێتاقەتی بەسەردا دێت ئەگەر چی پێشەوای سەرکەوتوو ئەوەیە کە هەرگیزاو هەرگیز ماندوو نابێت بەڵام بە پێچەوانەشەوە دە بێت کۆمەڵێک هەبن کە ئەو پێشەوایە ڕابگرن و یارمەتی دەری بن لەسەرخستنی دینەکەیدا، ئەگەر چی نەبوونی تاکی مسوڵمان لە ڕاپرسییەکەدا بە پلەی چوارەم و کۆتایی دێت کە لە % 5 ی دەنگدەران پێیان وایە ئەمیش یەکێکە لە هۆکارەکان بەڵام ئەمیش بۆ خۆی یەکێکە لەکێشەکان و نابێت پەڕاوێز بخرێت.

3.**نەبوونی زانیاری شەرعی**:

دیارە یەکێک لە وخاڵانەی تر کە بۆتە هۆکار بۆ پشێوی ناتە بایی مسوڵمانان نە بوونی زانیاری شەرعی یە کە بە ڕاستی ئەوەندە خەتەری هەیە بۆ سەر ئومەتی ئیسلام پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) بە یەکێک لە نیشانەکانی قیامەتی حسێب کردوە وەک لە فەرموودەیەکی صەحیح دائەنەسی کوڕی مالیک(ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوەکەپیغەمبەری خوا(صلى اللهعليهوسلم) فەرمویەتی:**(من أشراط الساعة أن يرفع العلم ويثبت الجهل)** واتە: لەنیشانەکانی قیامەت ئەوەیەکەزانست هەڵدەگیرێت و نەزانین دەچەسپێت.

[صحيح البخاري(1/178– مع الفتح)وصحيح مسلم(16/222– مع شرح النووي)]

لێرەدا زانست مەبەست زانستی شەرعی یەکەباسی لێوەدەکرێت لەفەرمودەکەدا وەهەورەها لەفەرمودەیەکی تردا کە(**شقيق**)بۆمان دەگێڕێتەوەو دەڵێت لەگەڵ(**عبد اللهو أبو موسا**)دا بووم ووتیان:پێغەمبەر(صلى اللهعليهوسلم)فەرمویەتی:**(إن بين يدي الساعة لأياماً ماينزل فيها الجهل ويرفع فيها العلم)**واتە: لەپێش قیامەتدا

ڕۆژانێک دێن نەزانینی تێدا دادەبەزێت و زانستی تێدا هەڵ دەگیرێت.
[صحيح البخاري(13/13– مع الفتح)]
بەڕاستی ئەگەر چاوێک بەمێژووی ئیسلام دا بخشێنینەوەلەسەردەمی هاوەڵانەوەتا تابیعین و تابیعی تابیعین و تا ئەمڕۆش بەتەواوەتی هەست بەو بۆشاییەگەورەیەدەکرێت لەناو مسوڵمانان دا کەلەڕۆژگاری ئەمڕۆدابەدەگمەن زانایەک پەیدا دەبێت یان ئەگەر پەیداش بوو تا نەمرێت پێی نازانین ئەوەندەزانست و زانیاری کەم بۆتەوەلەناو تاکی مسوڵمان دا پەنا بەخوا کە جاری واهەیە کەسی مسوڵمان نازانێت چۆن غوسڵ دەربکات کە لە کاتێکدا ئەمە یەکێکە لە پێداویستییە کانی مرۆڤی باوەڕدار!.
هەربۆیەلەفەرمودەیەکی ترداکەعبد اللەکوڕی عەمری کوڕی عاص(ڕەزای خوای لێبێت)بۆمان دەگێڕێتەوەدەڵێت: گوێم لەپێغەمبەری خوا بوو(صلى اللەعلیەوسلم)دەیفەرموو:(إن اللەلايقبض العلم إنتزاعآ ينتزعەمن العباد ولكن يقبض العلم بقبض العلماءحتى إذالم يبق عالمآ اتخذ الناس رءوسآ جهالا فسئلوا فأفتوا بغير علم فضلوا وأضلوا) واتە:خوای گەورەزانست هەڵناگرێت بەلێکردنەوەی لەدڵی بەندەکانی بکاتەوە،بەڵام زانست ناهێڵێت بەنەهێشتنی زاناکان ،هەتا کاتێک کەوای لێهات زانا نەما ،ئیتر خەڵکی کەسانێکی نەزان دەکەن بەگەورەی خۆیان وپرسیاریان لێ دەکەن،ئەوانیش بەنەزانی فتوایان بۆ دەدەن،سەر لەخۆشیان و ئەوانیش دەشێوێنن.
[صحيح البخاري(1/194– مع الفتح) وصحيح مسلم(16/223–224 مع شرح النووي)]
کەواتەلێرەبەدواوە بۆمان دەرکەوت ئەم زانستەشەرعی یەلەنێو دڵمان دادەرناکرێتەدەرەوە بەڵکو هەرکاتێک زانایەک وەفات دەکات کۆمەڵێک زانستی شەرعی لەگەڵ خۆی دا دەباتەژێر گڵ کەتا لەدونیادادەبێت کەم کەس هەیەئەو زانستەی لێ وەربگرن کاتێکیش دەمرێت ئەوکات هەست بەم ناڕەحەتییە گەورەیە دەکەین کە هیچ نازانین ، وەیەکێکی تر لە

هۆكاری نه بوونی زانستی شەرعی پەیوەست بوونە بە سەركردەیەكەوە یان زانایەكەوە لە كاتێكدا شەرت نی یە ئەو زانایە هەموو شتێک بزانێت یان لە هەموو بوارێكدا شارەزا بێت بۆیە قوتابی زانستی شەرعیش لێرەدا گیرۆدە دەبێت بە كە سێكەوەو وادەزانێت ئەوەی مامۆستاكەی ووتی شەرعەو ئەوەی مامۆستاكەشی باسی لێوە نە كات پێچەوانەی شەرعە كە ئەمە خۆی لە خۆیدا نەشارەزایی یە لە شە رعدا كە ئێمە پەیوەست بین بە تە نییا زانایەكەوە بەڵكو دەبێت لە هەوڵی ئەوەدا بین هەرزانایەو لە شوێنی خۆی دا قسەی لی وەربگرین واتە بە پێی ئەو شارەزایی یەی كە خوای گەورە پێی بە خشیوە بۆ نموونە زانا هەیە لە بواری فیقهدا شارەزاترە هەیە لە بیرو باوەڕدا هەیە لە مێژوودا هەیە لە فكری ئیسلامی دا هەیە لە تەزكییەی نەفس دا هەیە لە حاكمییەتی خوای گەورەدا وە لە چەندین بواری تری شەرعدا كە گرنگە ئێمە لەهەوڵی ئەوەدا بین بۆ هەر بوارەو بگەڕێینەوە لای شارەزاترین كە س لە زانایان نە ک هەر زانایەكمان خۆش ویست لە باش و هەڵە كانیش دا لە گەڵیدا بین بۆیەئەگەر دیقەت بدەین ئەم خاڵە لە ڕاپرسی یەكەدا بە پلەی سێ یەم دێت و لە % 8 ی دەنگدەران پێیان وایە نەبوونی زانیاری شەرعی بەشێكە لە هۆكارەكان چونكە هەركەسەو ووتەی ئەو زانایەی باس دەكات كە خۆشی دەوێت! كە ئەمەش خۆی بۆ خۆی جۆرێكە لە دەروێشایەتی و شەخس پەرستی خوا پەنابدات، دەبێت ئە ووشتانەی ڕاجییای لەسەرە بزانین كامییان بەڵگەی ڕاست و بەهێزی پی یە وا بكەین ڕای شیاوییان هەڵبژێرین و وە نابێت بە ندەی باوەڕدار بەتەنها لە هەوڵی فێربوونی زانستی دوونییای دا بێت و بێ ئاگا و نە شارەزا بێت لە زانستی شەرعی دینەكەی.

**4.نەگێڕانەوەی کارەکان بۆ قورئان و سوننەت**:

ئەوەی کە ماوە باسی بکەین کە زۆربەی مسوڵمانان بە خاڵی سەرەکی دادەنێن نەگێڕانەوەی کارەکانە بۆ قورئان و سوونەت! دیارە ئەگەر ووردبینەوە لەهەر کۆمەڵ و لایەنێکی ئیسلامی وا بانگە شە دەکات کە سەرچاوەی کاری قورئان و سوننەتە بەڵام ئایا تا چەندێک کار بەوە دەکرێت لەو لایەنەدا؟ ئەوە خۆیان و حسابییان لە لای خوای گەورە یە وە لێرەدا ئەوکەسەی کە ئیمامەتی کۆمەڵێک دەکات لە مزگەوتێکدا یان پێشەوایەتی کۆمەڵێکی ئیسلامی دەکات لێپرسراوییەتی یەکەمیان لەسەرە بۆ گەڕانەوەی کارەکانیان بۆ سەرچاوەی قورئان و سوننەت هەڵبەت بۆیە باسی ئیمام یان پێشەوا دەکەین چونکە نابێت کەسێکی نە شارەزا لە دین دا ئیمام یان پێشەوایەتی کۆمەڵێک بکات! وە زاڵ نەکردنی حەزو ئارەزووەکانی تاکی مسوڵمان بەسەر دەقە شەرعی یەکان دا کە جاری واهەیە مرۆڤی باوەڕدار بۆ ئاسان کردنی کارێک بەدوای دەیان فتوادا دەگەڕێت تاوەکو کارەکەی خۆی پێ جێ بەجێ بکات ئەمە لە کاتێکدا یە کە زۆرجار بەڵگەی قورئان و سوننەتی بۆ دەهێنرێتەوە کەچی ئەو هەر بەردەوامە لەسەر ئەوکارەی، هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو زانایانەی کە کار بە مەزهەب دەکەن لە پێش قورئان و سوننەت! یان جاری واهەیە کە بەڵگەیەک دە هێنرێتەوە بۆیان لەوەڵامدا دەڵێن: کاکە ئەو بەڵگەیە زۆر قورسە بۆ ئەم سەردەمە وە ئێمەو هاوەڵان زەوی و ئاسمانمان بەینە خوا پەنامان بدات ئیتر نازانم ئە و قورئان و سوننەتەی کە ئەو باسی لێوە دەکات کام قورئان و سوننەتەیە؟ ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ سەردەمی پێغەمبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) کاتێک باسی جولەکە دەکات دەفەرموێت دەبن بە حەفتاو یەک بەشە وە وە نە صرانیش دەبێت بە حەفتاو دووبەشەوە وە ئوممەتی ئیسلامیش دەبێت بە حەفتاو سێ بەشەوە دەفەرموێت: هەموویان دەچنە نێو ئاگر تەنیا کۆمەڵێکیان نەبێت ئەو کۆمەڵەش بە کۆمەڵی ڕزگار بو یان سەرکەوتوو وەسف دەکات کاتێک پرسیاری لێکرا ئەو کۆمەڵە کێن ؟

**ئەویش لەوەڵامدا فەرمووی: ئەوەی لەسەر ڕێ و شوێنی من و هاوەڵانمە.**

**ئێمەش دەڵێین ئەی هاوەڵان لەسەر چی کارییان دەکرد؟ هەڵبەت قورئان و سوننەت کەوابوو نابێت لە باسە شەرعییەکان دا ئێمەی مسوڵمان پێچەوانەی پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) هاوەڵانی بەڕێزی بکەین(ڕەزاو ڕەحمەتی خوایان لیبێت) بەڵام لە ڕووی پێشکەوتنی بواری زانستی دوونیاوە وەک گۆڕانکاری ئەسپ و حوشتر بۆ ئۆتۆمۆبیل و فڕۆکەو شەمەندەفەرو کۆمپیوتەروئەنتەرنیت و چەندین شتی کە دەبێت مسوڵمانان لە پێشتر بن وەک لە بێبڕوایان بۆ فێربوونی و بە کارهێنانی لە بواری چاک و خێردا ، ئەم باسە زۆر هەڵدەگرێت بەڵام ئەوەندە بەسە بەو دەرکەی کە زۆرێک لە دە نگدەران لە ڕاپرسیی یە کەدا لە 61% پێیان وابێت ئەمە یەکەمیین هۆکارە بۆ پشێوی و ناتەبایی مسوڵمانان.**

**لە کۆتاییدا ئەوەی کە ماوە بیلێم وەک بیرو بۆچوونی خۆم لەوانەشە هەڵە بم:**

**کە سەرەتای کێشەکە دەگەڕێنمەوە بۆ کەمی و نەبوونی پێشەوای ڕاستگۆ چونکە ئەگەر پێشەوای ڕاستگۆ هەبێت ئەوا کار بە هیواو ئارەزووەکانی ناکات و کار بەقورئان و سوننەت دەکات و تاکی مسوڵمانیش شوێنی دەکە وێت و لێوەی فێری زانیاری شەرعی دەبن دەروێش ئاسا پەروەردە نابن بەڵکو پێشەوا ئاسا پەروەردە دەبن و تە بایی و یەکڕیزی نێو خۆی مسوڵمانان دە پارێزن و هەمو مسوڵمانان بە برای خۆیان دەزانن و لە بەرامبەر یەکدا نەرم و نیانن و لە بەرامبەر بێباوەڕاندا سەربەرزو بە عیزە تن،ئەگەر چیش جیاوازی ڕاش هەبێت لە کار کردندا خوای گەورەش زاناترە.**

---

## ووتەو ڕای کۆمەڵێک لەکەسایەتی ئیسلامی و مامۆستایان و بانگخوازانی بەڕێزو خۆشەویست لە سەر:

## پشێوی و نا تەبایی مسوڵمانانی ئەمڕۆ؟

وەک لەسەرەتادا ئیشارەمان پێدا کەوا کۆمەڵێک نامە مان نارد لە ڕێی ئیمەیڵەوە بۆ زیاتر لە چل کەس لە مامۆستایان و بانگخوازان و لەنێو ئەوانیش دا سەرکردایەتی لایەنە ئیسلامییەکانی کوردستان و برایانی سەلەفی لە ڕێی ئەو ماڵپەڕانەی کە بیرو ڕای ئەو لایەن و کەسایەتییانە دەردەخەن و بڵاو دەکەنەوە، بەڵام بەهۆی سەرقاڵی و هەندێک عوزری شەرعیەوە هیچ کام لەسەرکردە کانی نێو ساحەی کوردستان وەڵامییان نەدایەنەوە! خوای گەورە پاداشتی خێری هەموو لایەک بداتەوە بەهەر حاڵ من نامەکەم لە 2010/4/4 دوە ناردووە بە دووبەش بەشێکییان بۆ لایەن و کەسایەتییە ناودارەکانی نێو ڕابوونی ئیسلامی و بەشێکیشییان بۆ مامۆستایان و بانگخوان کە ئەمە دەقی نامەکان بوو:

### بەشی یەکەم

---

السلام علیکم ورحمة الله وبرکاته

بەڕێزان : برایانی ماڵپەڕی ......................

سڵاوي خوای گەورەتان لێبێت

ئاشکرایە کە لەژیانی ئەمڕۆي مسوڵمانان دا کە م تا زۆرێک هەست دەکەین بە پشێوی و ناتە بایي وپەرتەوازەیی مسوڵمانان ئێمە ش وە ک

خەم خۆرێکی ئەم ئیسلامە ڕاپرسییە کمان ئەنجام داوە لە ماڵپەڕەکە مان دا کە لەم لینکە ی خوارەوەدا دەتوانن بیخوێننەوە

تێبینی: ڕاپرسییەکەمان لەسەرەوە بڵاو کردۆتەوە

وە دەمانەوێت تاوەکو بەرواری2010/1/5 ئەم ڕاپرسییە بەردەوام بێت ئەوەي کە ئێمە داوای دەکەین لە بەڕێزتان تەواو کردنی ئەو هۆکارانەیە کە بۆتە هۆی نا تە بایی مسوڵمانان بە ڵکو بتوانین بە هە مومان ئەو بۆ شاییانە پڕبکە ینەوەو بیخەینە بەرچاوی مسوڵمانان وە بەڕێزتان ئەو ئەرکە بکێشن یا بەڕێز مامۆستا ......... ئەو هۆکارانەمان بۆ بنوسێت چونکە بەڕێزیان کە سایەتییەکی دیاری نێو ڕابوونی ئیسلامی یە هەر بۆیە دە مانەوێت لە دوای ئەو بەروارەوە ڕاپۆرتێکی گرنگ ئامادە بکەین سەبارەت بە و نە هامەتییە ی کە توشی مسوڵمانان بوە بە ڕێزیشتان ئەو هۆکارەی بە چاکی دەزانیت بۆمان بنوسە و ئێمە ش لە نێو ڕاپۆرتەکەدا بڵاوی دەکە ینەوە إن شاألله چاوەڕوانین؟

لە گەڵ ڕێزی برای بچوکتان

باوکی ئەسماء

---

## بەشی دووەم

---

السلام علیکم ورحمة الله وبرکاته

بەڕێزان مامۆستایان و بانگخوازان ونوسەرانی ئیسلامی
سڵاوي خوای گەورەتان لێبێت
ئاشکرایە کە لەژیانی ئەمڕۆی مسوڵمانان دا کە م تا زۆرێک هەست

دەکەین بە پشێوی و ناتە بایی وپەرتەوازەیی مسوڵمانان ئێمە ش وە ک
خەم خۆرێکی ئەم ئیسلامە ڕاپرسییە کمان ئەنجام داوە لە ماڵپەڕەکە مان
دا کە لەم لینکە ی خوارەوەدا دەتوانن بیخوێننەوە

تێبینی: ڕاپرسییەکەمان لەسەرەوە بڵاو کردۆتەوە

وە دەمانەوێت تاوەکو بەرواری2010/1/5 ئەم ڕاپرسییە بەردەوام
بێت ئەوەي کە ئێمە داوای دەکەین لە بەڕێزتان تەواو کردنی ئەو
هۆکارانەیە کە بۆتە هۆی نا تە بایی مسوڵمانان بە ڵکو بتوانین بە هە
موومان ئەو بۆ شاییانە پڕبکە ینەوەو بیخەینە بەرچاوی مسوڵمانان
هەر بۆیە دە مانەوێت لە دوای ئەو بەروارەوە ڕاپۆرتێکی گرنگ ئامادە
بکەین سەبارەت بە و نە هامەتییە ی کە توشی مسوڵمانان بوە بە
ڕێزیشتان ئەو هۆکارەی بە چاکی دەزانیت بۆمان بنوسە و ئێمە ش لە
نێو ڕاپۆرتەکەدا بڵاوی دەکە ینەوە إن شاألله چاوەڕوانین؟
لە گەڵ ڕێزی برای بچوکتان
باوکی ئەسماء

---

## وەڵامەکان بە پێی زوو وەڵام دانەوە بڵاو دەکەینەوە إن شاألله

## ئەو وەڵامانەی لە ڕێی ئیمەیڵەوە وەڵامیان دراوەتەوە

## یەکەم: بەڕێز مامۆستا ئارام قادر ئەندامی پەرلەمانی کوردستان و ئەندامی مه کتەبی سیاسی کۆمەڵی ئیسلامی



**لەم چوار خاڵەی خوارەوەدا کێشەکانی بۆ خستووینەتە ڕوو**

1– ئەنانیەت و خۆ ویستی لە کەسایەتی لایەنە ئیسلامییەکان.

2– نەبوونی میکانیزمێکی گونجاو بۆ یەکخستنی لایەنە ئیسلامییەکان.

3– لاوازی لەڕووی فکری و سیاسی یەوە.

4– زاڵ کردنی بەرژەوەندییە تایبەتییەکان بەسەر بەرژەوەندییە ئیسلامییەکان.

---

## دووەم: بەڕێز ماموٚستاحسن پێنجوێنی نوسەرو کەسایەتی دیاروناوداری نێو ڕابوونی ئیسلامی لە کوردستان



### هۆکارەکانی گەڕاندەوە بۆ ئەم چەند خاڵە:

بسم الله الرحمن الرحيم

برای باشم باوکی ئەسما

السلام عليكم ورحمه الله

سەرەتا دەست خۆشیت لێدەکەم و ماندوو نەبوونیت پێ دەڵێم بەرامبەر بەو خەم خۆریەت و خوا مەبەست و نییەتمان بۆخۆی پاڵفتە بکات و بۆت بخاتە تای ترازووی کردەوە چاکەکانتەوە لەرۆژی قیامەتا ..

پاشان بۆ ئەو ڕاپرسییەی نووسیبووتان لەسەر سایتەکە، من ڕۆیشتمە سەر سایتەکەو چاوم بە ڕاپرسییەکە کەوت و ئەو سێ پرسیارەم بینی بۆ ئەوەی خەڵکی ڕای بۆ بدات، ئایا کامیان هۆیە بۆ پشێوی و ناتەبایی وپەرتەوازەیی مسوڵمانان ؟

لەبەر ئەوەی من خۆم هیچکامیانم بەهۆکار نەدەزانی کرتەم لەسەر هیچیان نەکرد، چونکە من پێم وایە کۆمەڵێ شتی تر هەن هۆی دروستبوونی ئەو حاڵەتەن.. پێش ئەوەی ئەو خاڵانە دیاری بکەم – کەبەڕای من هۆکاری سەرەکین بۆ گەشەنەکردن و بەرەو پێشنەچوونی کاری موسوڵمانان – پێم باشە پێشەکیەک باس بکەم وەک کەرەسەیەکی ڕونکردنەوە:

1– کاتی خۆی من منداڵ بووم لەساڵانی 1959 بەدواوە ئەم حیزبی ئیسلامییەی ئێستای عیراق هەفتەنامەیەکیان هەبوو بەناوی { ئەلحیاد} باوکیشم کە ئیمامی مزگەوت بوو بۆیان دەنارد، جارێکیان داوایان کردبوو کە ئیمزا کۆبکەنەوە بۆ پشتگیری کردن لە حیزبی ئیسلامی، باوکیشم بەخەڵکەکەی گوت.. کەسانێکی عەلمانی و کۆمۆنیست کە خزمیشمان بوون لەژێرەوە خەڵکەکەیان فێردەکرد بەمامۆستا بڵێن: خۆ ئێمە هەموو موسوڵمانین، ئیتر حیزبی ئیسلامیمان بۆ چییە؟ خۆ کافر نین تا ببینە مووسڵمان.. !! .

2–تا ئێستاش هەندێ لە حیزبە زلەکانی لای خۆمان هەمان قسە بەکاردێنن.. و دەیانەوێ فێڵ وچاو و راو لە میللەتەکە بکەن، دەنا ئەگەر بەپێی ئەو بۆ چوونەی ئەوان بێت دەبێ خەڵکی بڵێت: خۆ ئێمە عەرەب نین تا بمان کەنە کورد، ئەی حیزبی کوردیمان بۆ چییە؟! ئایا قسەی وا مەعقوولە؟!

3– ئەو حاڵەتەی کە لەناو میللەتەکەی خۆماندا هەیە لەتورکیاشدا هەر لەساڵەکانی 1960 هەبوو تا سەرەتای نەوەدەکانی سەدەی رابوردوو، ئیسلامییەکانی ئەو وڵاتە کە دەرۆیشتنە هەڵبژاردنەکانەوە دەنگێکی کەمیان دەهێنا، من لەبیرمە سێ لیرەی تورکی یەک دۆلار بوو، تاوای لێهات یەک دۆلار نرخەکەی گەیشتە یەک ملیۆن لیرەو بەڵکو زیاتریش .. هەر خەڵکی دەنگیان بۆ عەلمانییەکان دەداو بە فێڵ و گزی و درۆی ئەوان دەخڵەتان.. تا وای لێهات خەریک بوو وڵاتەکەیشیان بفرۆشن.. ئینجا خەڵکەکە گوتی: دەبا ئەمانیش تاقی بکەینەوە.. ئەوەبوو کاتێ تاقییان کردنەوە، زۆر بەرزتر بوون لەوەی ئەوان چاوەڕوانی بوون.. ئەوەتە دوو دەورەیە بەتەنیا حکومەت دروست دەکەن و حیزبە عەلمانییەکانیان خستە پشت کەنووی مێژووەوەوە، و هەنگاو بە هەنگاو چاکسازییان دەست پێکرد..

**بۆیە من پێم وایە هۆکاری سەرەکی دەگەڕێتەوە بۆ ئەم خاڵانەی خوارەوە:**

**یەکەم: نەبوونی هۆشیاری تەواو لەناو هەرەمەی خەڵکیدا.. بۆنموونە: ئیسلام ئاینی خوایە و بۆ هەموو گۆشەیەکی ژیانی مرۆڤە.. بەڵام ناحەزانی ئیسلام بەخەڵکەکە دەڵێن: کاکە! ئەمانە شتێکیان لەژێر سەرایە، خۆ ئێمە کافر نین، ئیتر حیزبی ئیسلامی چی؟؟ یا ئێمە کێشەی دینیمان نییە!! کێشەی قەومیمان هەیە!! و لەم بابەتانە.. خەڵکەکەش ئەوەندە هۆشیاری فیکری نییە تا لەوبارەوە وەڵامی دەمکوتیان بداتەوە..**

**دووەم: فێڵبازی و درۆزنی عەلمانییەکانی وڵات.. فێڵ لە خەڵکی دەکەن ، و دەڵێن: کاکە ئیسلام دوورە لە سیاسەت، سیاسەت واتە درۆ .. ئایا دەکرێ بڵێین : ئیسلام درۆیە؟! ئاوەها خۆی دەکات بە غەوسی گەیلانی!!**

**سێ هەم: پارەو پووڵ و دەسەڵات.. دەبینن کاتێ مووچەخۆرێک ئەگەر لەگەڵ ئیسلامییەکانا بێت دووری دەخەنەوەو دەینێرن بۆ ناوچەیەکی دوور، یا لەسەر کار لای دەبەن، یا کاری بۆ جێ بەجێ ناکەن.. لەولایشەوە ئەوەی کە لەتەکیاندایە لە ژیانێکی خۆش و کۆشک و تەلارا دەژین و هەموو کارێکیان بۆ ئەنجام دەدرێت.. ئەمانە هەمووی دەبنە هۆی دوور کەوتنەوە لە ئیسلامییەکان..**

**چوارەم: بوونی مەلایەکی زۆرلەناو ئەو حیزبانەدا کە لەسەر مینبەری مزگەوتەکانەوە دەنگیان بۆ دەدەن و خەڵکیان بۆ بانگ دەکەن.. ئەمەش دەبێتە هۆی چەواشە کردنێکی تری..**

**پێنجەم : ترسی هەرەمەی خەڵکی لە دەسەڵات لەوە دەترسێت کە بەترۆریست بیداتە قەڵەم و ئەوسا بینێرن بۆ ئەو زیندانانەی هەتاویش نەبینن.. ترساندنیان بەوەی ئەمانە بەحوکمی ئیسلامی بوونیان نۆکەری عەرەبن و میللەتەکەمان دەفرۆشن.. !!**

**شەشەم: پاڵفتە نەبوونی نێت و مەبەستی بەشی زۆری ئێمەی ئیسلامیش.**

**حەوتەم: چەواشەکردنی هەڕەمەی خەڵکی لەلایەن کۆمەڵە کەسانێکەوە کە بەئیسلامی دادەنرێن، و ئەمانەش زانایان و پێشەوایانی رابوردووی موسوڵمانان بە سەفیە و گەمژە دادەنێن و بەلادەریان دەناسێنن، و توند رەوی ئەو گرۆپ و لایەنانە و بەکافرکردنی خەڵکی موسوڵمان، و پێداگرتن لەسەر ئەوەی تەنیا مەزهەبێکی دیاریکراو ئیسلامە،و ئەوانی تر سەر لێشێواو وسەرگەردانن.. ئەمەش کاریگەری لەوان کەمتر نییە، ئەگەر گەورەتر و خراپتر نەبێت..**

**لە کۆتاییدا قەدەری خواییشمان لەبیر نەچێت خوای باڵادەست لەبەر حیکمەتێکی خۆی و بۆ پاڵفتەبوونی موسوڵمانان سەرکەوتنی دوا خستوون..**

---

## سێ یەم: بەڕێز مامۆستا عومەر علی پێش نوێژو ووتار خوێنی مزگەوتی نوور لە وولاتی بەریتانییا




**هۆکانی لەم شەش خاڵەی خوارەوەدا خستۆتە ڕوو:**

**1- گرنگی دان بە دەعوەو تێکەڵی پتەو لەگەڵ ئەندامانادا.**
نمونەی کاڵی ئەو خاڵەم زۆر لایە ئێستە لە زۆر جیگە ئەندامیان هەر بۆ کاتی دەنگدان دەوێت ئەمەش هیچ جیاوازیەک نامێنێت لەگەڵعەلمانیدا.
**2- خیتابی ڕاست و دوو ڕووی نەبوون.**
بۆ نموونە من ئاگادارم یەکگرتووەکان لای ئیخوان خۆیان بە ئیخوان دەزانن کەچی بەڵگەشم بە دەستەوە کە دەڵێن ئێمە ئیخوان نین و تەنها سودمان لە فکری ئیخوان وەرگرتووە.
**3- دوورکەوتنەوە لە تۆمەتبار کردنی یەکتر.**
نموونەی ئەمە لەناو هەردوو یەکگرتوو کۆمەڵدا زۆرە هەر لە خۆیان نەبیت ئیتر بە مونحەریف و فکر دۆڕاو دەستی ئەملاو لا ناوت دەبەن.
**4- هەڵسەنگاندی باشتری کادیرەکان پێش دانی پلە پێیان.**
نموونەی ئەمەش هەر زۆرە کەسی وا دەزانم پارتی بووە لەماوەیەکی کەمدا پۆستی گەورەی حیزبی وەرگرتووە، سوێند دەخۆم بەخوا 100 پرسیاری شەرعی لێ بکەیت 4یت بەحەدیسی زەعیفیش جواب ناداتەوە.
**5- بەدەمەوە چوونی کێشە لە کاتی خۆیدا.**
هەر لە ناوچەکانەوە بیگرە تا دەگاتە لق و مەڵبەندەکان، کەمتەرخەمی زۆرکراوە لە بەدەمەوە نەچوونی کێشە لەکاتی خۆیدا دووکەس لەسەر

شتێک تێگیراون ئەوانیش هەر زۆر بە سادەیی و سانابیەوە سەیریان کردووەو، دواتر کە گەورە بووە ئەوسا هەستیان پێ کردووەو دواتریش چارەسەر نەکراوە.

**6- ئالیەت دانانێکی پتەو کەتا هەموو کەس سنوری خۆی بزانێت.**

کەسی وا هەیە مەنسەبێکی بچوکی هەیە لەناو کۆمەڵدا حساب بۆ مامۆستا عەلی باپیریش ناکات، بە پیچەوانەشەوە لەناو یەکگرتوودا ئەوەندە تەعەسوب بۆ مەسولەکان هەیە قسەیان پێش قسەی خواو پێغەمبەریشی دەکەن.

ئەوەندە بە بەس دەزانم لەلایەنی منەوە هەرچەند شتم زۆرە بە نمونەو ناوی شەخسەکانیشەوە.

---

## چوارەم: بەڕێزکاک فەرمان محموود نوسەرو ڕۆشنبیری ئیسلامی

لە چەند دێرێکدا هۆکانی بۆ خستوینەتە ڕوو :

بەڕێزم خودای گەورە پاداشتی خێرت بداتەوە کارێکی پیرۆزت ئەنجام داوە بمان بوورە لەکەم وو کووڕی و دواکەوتن ، خۆشەویستی لای هەمووومان، من لەخزمەتدام، پێم وایە بۆ وەڵامی ئە و باسە مسوڵمانان پشت بە مێژوو ببەستن باشترە وەئاماژەشم پێ کرد لە لینکە کەی بەڕێزت دا، بەڕێزان من لاوازی لێکترازانی بەرەی ئیسلامی دەگەڕێنمەوە بۆ نەگێڕانەوەی کارەکان بۆ قورئان ، چوونکە مێژووی ئیسلامی ئەوڕاستیەی سەلماندووە بۆ نموونە لەسەردەمی صەڵاحەدینی ئەیوبی دا مسوڵمانانی پابەند دەکرد بەشەونوێژەوە و بۆ خوودا بوون و دڵسۆزی، پێغەمبەرمان دروودی خوای لێبێت باسی ڕوودانی لێکترازان و فیتنەی پاش خۆی کردووە ، ڕێزم بۆت هەیە.

---

## پێنجەم: بەڕێز مامۆستا هێمن عبدالعزیز بانگخوازو نوسەری ناوداری ئیسلامی

**لە بیست وپێنج خاڵدا هۆکارەکانی بۆ خستوینەتە ڕوو:**

سەرەتادەستخۆشیت لێ دەکەم برای بەڕێز مامۆستا باوکی ئەسما گیان، خوای گەورە سەرکەوتووتان بکات و هەوڵ وکۆششەکانت بۆ بکات بە مایەی خێر بۆ هەموو لایەک چاوڕوونی و خۆشگوزەرانیت بە ڕەزامەندی خواو بەهەشتی بەرین مسۆگەرکەیت.

بەندە هۆکاری لاوازبوونی مسوڵمانان و هۆی پشێوییەکانی نێوانیان بە کورتی بۆ چەند خاڵێک دەگەڕێنمەوە:

1. **پێشی هەموو شت پێکەوە گرێ نەدانی عیلم و عەمەل:** واتە عەقیدەو تەزکییە، من وا ئەزانم کە عەقیدە عیلمەو تەزکییەش تەنفیزە، زۆرێک هەن شارەزان لە بواری عەقیدەوە، بەڵام تەزکییەیان نییە، بۆیە ناتوانن خۆیان شتێ بکەن کە ئەیڵێن، ئەزانین کە خۆشەویستنی مسوڵمانان لە گۆشەی عیبادەی قەلبییەوە جێی ئەبێتەوە کە پەیوەستە بە عەقیدەوە، بەڵام بە هەقیقەت خۆش ویستنی مسوڵمانان و ڕێز گرتن لێیان تەزکییەی نەفس دیاری ئەکات.. بۆیە ئەبینین زۆرێک لەوانەی کە شارەزان لە عەقیدە چونکە تەزکییەیان نییە ئەبینین دەمیان بە جنێوو سووکایەتی بە مسوڵمانان ڕاهاتووە (والله المستعان).
2. **نەترسان لە خواو جورئەت بوون لەسەر تووڕەکردنی،** لەکاتێ کە خوا دەفەرموێت: [إنما المؤمنون اخوة فاصلحوا بين اخويكم ] هەموو ئەمرێکیش بۆ وجوبە، کەوابوو ئەوەی ڕێز لە مسوڵمان ناگرێت ڕێز لەفەرمانی خواش ناگرێ.
3. **چاولێکەری مامۆستاکان،** ئەبینین کەوا مامۆستایەک لە قۆناغێکی ژیانیدا ئەزموونێکی تاڵی لەگەڵ چەند کەسێک دا هەبووە، بەڵام ئەبینین ئەزموونی خۆی ئەخاتە ڕێگەی پێگەیاندنی چەند کەسێک بەڵام لەسەر ئاستی دژایەتی کردنی خەسمەکەی!!

**4. شەڕی نەفس، جنێو بەخوا ئەدرێت بێ دەنگین بەڵام جنێو یا ڕەخنە لە ڕەوت و ڕێبازمان ئەگیرێت قیامەتمان لێ هەڵدەسێت.**
**5. هەمان دەروێش و شێخایەتی لە ڕابوونی ئێستاماندا سەری !! هەڵداوەتەوە**
**6. گوێ نەگرتن لە خاوەن ئەزموونەکان !**
**7. حەسادەت.**
**8. چاولێکەری**
**9. (تبين) نەکردن لەسەر شتەکان.**
**10. حەز کردن بەهەڵەی بەرامبەر تا لێی گەورەبکەین .**
**11. گەڕان بەدوای عەیبی یەکتر، یان عەیب لەیەکتر درووست کردن.**
**12. هەرچی شتێک گوێمان لێ ئەبێت بێ چەندو چوون ئەیڵێینەوە [ كفي بالمرأ كذبا ان يحدث بكل ما سمع ] بەسە بۆ ئەوە کەسێک درۆزن دەرچێت لەوە کە هەرچی گوێی لێ ئەبێت و ئەیڵێتەوە.**
**13. نەشاردنەوەی عەیبی یەکتر لەکاتێ کە شاردنەوەی عەیبەکان واجبە.**
**14. لەگەڵ یەک بەهەنجەت بوون.**
**15. سەیر نەکردن لە تەئسیلی یەکتر، ئەبینین کە یەکێک خۆی لەسەر مەنهەجێکی خوارو خێچە کەچی هەر هەڵەیەکی تیا ئەبینین بیرمان لەسەر مەنهەجە خوارو خێچییەکەی لا ئەچێ و سەیری حاڵی هەڵەی کەسەکە ئەکەین.**
**16. عوزر بۆ یەکتر نەهێنانەوە.**
**17. پیلانی دوژمنان.**
**18. بەتاڵی.**
**19. چاولێکەری.**
**20. قسەکردن لەسەر نییەتی کەسەکان!!**
**21. هەڵەی ئیسلامییەکان بۆ خۆیان، یان چاک نیشان نەدانی ئیسلام لە لایەن ئەوانەوە.**

**22. پشتکردن له ئامانجی  ئیسلامیمان و خۆ خەریک کردن به یەکتر.**
**23. هەست نەکردن به پیرۆزی مسولْمانان که حورمەت و ڕێزیان له بەرده ڕەشەکەش لای خوا گەورەتره.**
**24. پاڵتاڵک و بێ ئیشەکان و هۆگربووان پێیەوه!!!!!** که بەنده به تەجرووبەی 7 ساڵم لەو دەزگایه گەیشتمه قەناعەت کەوا بانگەوازکردن لەم دەزگایه ڕێگەیەکی سەلیم نییه، چەنده خێری هەیه، ده ئەوەنده فیتنەی هەیه، زۆرمان بیستووه لەوه که خیانەتی زەوجی و تەڵاق و گومان لەیەکتر پەیاکردن و دڵ لەیەکتر شکاندن و... له ڕێگەی پاڵتاڵکەوه درووست بووه، جۆرێک له بێ ئەدەبی مسوڵمانانیش بەرامبەر به یەکتر لەم ڕێگەوه درووست بووه، نیفاقی کەسانێک و هەڕەشەو گوڕەشەکانیش لەمسەرەوه بوەستێ...
**25. حیزبایەتی!!!**
بەڕاستی زۆر خاڵی تر هەن که قسەیان لەسەر بکەین، بەڵام من وا هەر خەریکه ئەنووسم و کەچی ئەبینم هەروا خاڵی تری بەدوا دادێت!!
بەڵام دەی ئەوەندەی که باسیشم کرد وەبیر خۆمان بهێنینەوه هەر باشه، زامنی هەموو ئەوانەش که عەکسەکەی دەرچێ و برایەتی ئیسلامیی له ناوماندا بەرقەرار بێتەوه بریتییه له (تەقوا) و بەندکردنی زمان بۆ هەتا هەتایی و سەیرکردنی عەیبی خۆت پێشی عەیبی خەڵکی و حەسەنات کۆکردنەوه به ڕێزگرتن له خەڵکی دەنا به (الله) قەسەم لەو دونیا موفلیس دەر ئەچین و به قەد یەک کێوی ئوحود چاکەمان هەبووبێت سەیر ئەکەین نامێنێ و  لەگەڵ ئەڕزا تەخت بووه!!! خوا پەنامان بدات.

---

## شەشەم: بەڕێز مامۆستا حەمزە بەرزنجی بانگخوازو نوسەری ناوداری ئیسلامی

**لە پێنج خاڵدا هۆکارەکانی بۆ خستوینەتە ڕوو:**

بسم الله وبه نسنعين

بەڕێزم ئەوەندەی بە فەهمی لاوازی خۆم بۆی بچم: لاوازیو پشێویی و ناتەبایی موسڵمانان دەگەڕێتەوە بۆ کۆمەڵێک خاڵ:

1- سەرەتا دەگەڕێتەوە بۆ لاوازی پەروەردەی ئیمانی و شەرعی لە لایەن تاکی موسڵمانان خۆمانەوە.. بە جۆرێک ئەوەندەی خەریکین بە شتی لاوەکی و منداڵانەوە ئەوەندە تەمەنی گەوهەر ئاسامان لە خزمەت خۆ پڕچەککردندا سەرف ناکەین لە زانستە شەرعییەکان, واتە موسڵمانێکی عەوامین..نوێژو ڕۆژوومان هەیەو بە دڵ حەزمان بە سەرکەوتنی ئیسلام و موسڵمانانە, بەڵام کام ئیسلام؟؟ ئەو ئیسلامەی تەنها ڕووکارەکەیمان بیستووەو بە سەرپێیی ڕۆشنبیرییەکی کەممان هەیە لە بارەیەوە.. خۆ ئەگەر ئەو ئیسلامە گەورەیەمان وەک پێویست بناسیایە لەسەر شەرع و لەبەر خوا هەڵوێست و هەنگاوەکانمان دەنا نەک لەبەر هەواو ئارەزوو, وە لەو هۆکارانەش راستر لەو تاوانانەش کە بە هۆی کەمی لایەنی تەزکییەو پەروەردەیییەوەیەو دەبێتە هۆی پشێوی و پەرتەوازەیی: رق لەیەکتری هەڵگرتن..حەسوودی بردن...خۆش ویستنی دونیا...شانازی کردن بە سەروەت و سامان و دونیاوە....

**جا لە دەرئەنجامی ئەم کەم شارەزاییەش:**

أ- زوو سارد دەبینەوە لە دینداری و عیبادەتەکانمان.

ب- بە بچوکترین گومانی نەیارانی ئەم دینە ئەکەوینە گومانەوە لە ئیسلام و دروشم و ناودارو سەرکردە موسڵمانەکانمان.

ت- توانای ڕووبەرو بونەوەمان نییە لەگەڵ ئەوانەدا کە بە زۆرزانی نەک بە نەزانی دژایەتی ئیسلام دەکەن.

2- هۆکارێکی تری ئەم ناتەباییيە خودی موسڵمانان خۆمانین کە یەکتری ناشیرین دەکەین, زۆر جار بەڵگەو بەهانەش دەدەینە دەست عەوامەکانیش تا لە هەموو لایەکمان هەڵبێن. ئەویش بەوەی لە جیاتی ئەوەی لە خاڵە هاوبەشەکاندا هاوڕا بین و لە خاڵە ناکۆکەکانیشدا عوزر بۆ یەکتری بهێنینیەوە دێین بە دوای (**ذلة الكلام**)دا دەگەڕێین.. سەلەفی بە حیزبی دەڵێت گومڕاو گومڕاکەرو حیزبیش برایانی سەلەفی بە عەمیل و کرێگرتەو خۆشی بە عەیارە 24و بێ لەکە ناو دەبات.. جیهادی کاری بانگخواز بە کەم دەگرێت و ئەویش ئەمیان بە خەواریج و هەڵەشە دەناسێنێت.. ئەوەشی خەریکی عیلمە مانای (**الفرقة الناجية**) لە (**أهل الحديث**)و بەس کورت دەکاتەوەو واز لە پێناسەکانی تری ئەهلی عیلم دێنێت.

3- هۆکارێکی تری ئەم ناتەباییيە دەگەڕێتەوە بۆ خەم ساردی و بە گرنگ تەماشا نەکردنی ئەم دەردەو نەگەڕانە بە دوای چارەسەردا لە لایەن بزووتنەوە ئیسلامییەکانی جیهان. بە تایبەت کوردستان بە ئەندازەی ئەوەندەی موسڵمانێکی سادەی وەک ئێمەومانان هەستی پێ دەکەین و ئاهی بۆ هەڵدەکێشین. بۆیە دەبینی ئەوەندەی خەڵکی نەو موسڵمان و عەوام بە خەمی چارەسەری ئەم پەرتەوازییەوەن ئەوەندە سەرکردەو بزاڤەکانمان لەخەمیدا نین..هەربۆیە دەبینی لە هەڵبژاردنێکی پەرلەمانی و دەنگدانێکدا ناتوانن قەناعەت بە خۆیان بکەن لەو بوغراییەی خۆیان بێنە خوارەوەو ئایەتی (**واخفض جناحك للمؤمنين**) بە کردار بکەن. دەرئەنجامەکەشی چونکە کارێکی ناشەرعی و ناعەقڵییە باجێکی زۆر دەدەن و متمانەی گەورەیان لە دڵی عام و عەوامی موسڵماناندا لە دەست دەدەن.

4- فەرامۆش کردنی تەدەروج و هەنگاو بە هەنگاو لە میانەی کاری بانگەوازدا دەبێتە هۆی پەرتەوازەیی و پەشێوی چونکە هەرکەسەو بە پێوەرێک خاڵی بنچینەیی دیاری دەکات نەک بە پێوەری شەرع..

ئەشتوانین ئەم خاڵە ناوبنێین فەرامۆش کردنی کارکردن بە قورئان وسوننەت و دروست بوونی (بە عەقڵ کار کردن)لە میانەی دانانی شێوازی کارو بانگەوازدا..هەر ئەمەو هاووێنەی ئەم بۆچوونەیە پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لە فەرموودەکەی حوزەیفەدا (ڕەزای خوای لێ بێت) لە باسی ئەو خێرەی دوای گومڕایی و خراپەی یەکەم دێت ناوی دەبات بە دوکەڵ و لیڵی و بەوە ڕاڤەی دەکات کە: (**قوم يهدون بغير هديي ويستنون بغير سنتي تعرف منهم وتنكر..**), کەواتە ئەولەویەت ئەوەیە کە خواو پێغەمبەرەکەی(صلى الله عليه وسلم) دایاننناوە کە بریتییە لە گەڕانەوەمان سەرەتا لەتاکەی موسڵمانەوە دەست پێ بکەین بۆ لای بیروباوەڕو عەقیدەی یەکخواناسی و تەوحیدی توندو تۆڵ و ڕاگەیاندنی راستەوخۆی وەلائو بەراء بە بێ موجامەلەو سەر لە خۆمان و خەڵکی تێکدان و ئاشکرا کردنی (**لكم دينكم ولى دين**) نەک راکردن بە دوای دروست کردنی حکومەت و پەرلەمان و کورسی و دەستەڵات و سولتەو فەرمانڕەوایەتی بە بێ دانانی بناغەکانی مانەوەی ئەو دەستەڵاتەو ئامادەسازی عیلمی و شەرعە تا ئەگەر دەستەڵاتمان کەوتە دەست نەبینە عەلمانیەتێکی ترو لەبەرگی ئیسلامیدا..چونکە ئەگەر ئەمە ئەولەویەت بووایە وەک زۆرێک لە لایەنە ئیسلامییەکانی جیهان وا تێگەیەنراون..ئەوا پێغەمبەری رابەر (صلى الله عليه وسلم) کاتێک قورەیش لە مەککەدا سەرپشککیان کرد لە نێوان کۆمەڵێک شت بە مەرجی واز هێنان لە بانگەواز لە ناویاندا فەمانرەوایەتیەک کە بە بێ ئەو هیچ مەسەلەیەک نەبڕێننەوە., ئەوا ئەوەی هەڵدەبژاردو بەو هەموو کۆسپ و لەمپەرانەدا خۆی و هاوەڵە دلێرەکانی نەدەرۆیشتن.

5- خاڵێکی تر نەبوونی یەک مەرجەعیەت و سەرکردایەتی جێ متمانەو خواناس..چونکە بنەماکانی سەرکردایەتی کردن بریتییە لە متمانە..خۆشەویستی...بیستن...گوێڕایەڵی.. هەتا موسڵمانان متمانەیان بە دین و تەقوای کەسێک نەبێت خۆشیان ناوێت هەر بۆیە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) سەرەتا ئەوەی لە خەڵکی دەگەیاند کە

**فریادرەسیانەو دڵسۆزە بۆیان و (نذیر العریان)ە.. وە هەتا خۆشیان نەویێت قسەی نابیستن و و گوێڕایەڵی ناکەن....هەر بۆیە لە فەرمودەکانیشدا هاتووە کە خوای گەورە کاتێک محمدی مەهدی دەنێرێت کە ئوممەتی ئیسلامی لە کاتی ئەوپەری ئاشووبەو پەرتەوازەییدان و ئاتاجی سەرکردەیەکن کۆیانبکاتەوە.**

**خاڵ و هۆکاری تر زۆرن دیارە عەقڵی کورتی ئێمەومانان هەر ئەوەندەی توانیو لە تاو گرفت و سەرقاڵی نەمتوانی لەوە زیاترتان بۆ بنووسم...خوای گەورە بە فەزڵ و منەتی خۆی دامەزراومان بکات تا ببینە رێنمونی کراوێکی رێنمونی کار... وە نەبینە نێچیری شەیتانە ئینس و جنییەکانی سەردەم و گومڕاکەرو گومڕاکار نەبین. خوای گەورە پاداشتی ئەم فیکرە جوانەی ئێوەش بداتەوەو یارمەتی ئێمەش و هەموو موسڵمانانیش بدات ئەوەی کەدەیزانین کرداری پێ بکەین تا ببینەوە بە خەیرە ئوومەکەی جاری جاران........... آمین**

---

## هەشتەم: بەڕێز مامۆستا فەرمان نەجار خەرابەیی پێش نوێژ و ووتارخوێن



**هۆکاری پشێوی و ناتەبایی مسولمانان، ئەوەی من بۆی بچم لە دوو شت کۆی دەکەمەوە:-**

**1. خۆش ویستنی دنیا:**

**زۆرێک لە موسڵمانان ئەوەندەی هەوڵی دنیا ئەدەن ئاوا هەوڵی قیامەت وتەزکیە و دینەکەی نادات.. جا ئەو کەسە کەسێکی ئاسایی بێ یان سەرکردە بێ.. پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) زۆر بە ڕوونی ئەم هۆکارەی بۆ ڕوون کردوینەتەوە کە دەفەرمووێ:**

« يُوشِكُ الأُمَمُ أَنْ تَدَاعَى عَلَيْكُمْ كَمَا تَدَاعَى الأَكَلَةُ إِلَى قَصْعَتِهَا ». فَقَالَ قَائِلٌ وَمِنْ قِلَّةٍ نَحْنُ يَوْمَئِذٍ قَالَ « بَلْ أَنْتُمْ يَوْمَئِذٍ كَثِيرٌ وَلَكِنَّكُمْ غُثَاءٌ كَغُثَاءِ السَّيْلِ وَلَيَنْزِعَنَّ اللَّهُ مِنْ صُدُورِ عَدُوِّكُمُ الْمَهَابَةَ مِنْكُمْ وَلَيَقْذِفَنَّ اللَّهُ فِى قُلُوبِكُمُ الْوَهَنَ ». فَقَالَ قَائِلٌ يَا رَسُولَ اللَّهِ وَمَا الْوَهَنُ قَالَ « حُبُّ الدُّنْيَا وَكَرَاهِيَةُ الْمَوْتِ ».

**2. نەگێڕانەوەی کارەکان بۆ قورئان و سوننەت:**

**ئەمەش هۆکارێکی ترە کە هەرکەسە بێت بۆ بەرژەوەندی خۆی ئیسلام دارێژێ نەک بەپێ قورئان و سوننەت، بەڵکو قورئان و سوننەت بۆ بەرژەوەندی مەزهەبەکەی عەشیرەتەکەی حزبەکەی بە کار دەهێنێت، نەک ئەوەی هەر کێشەیەک دروست بوو بیگەڕێنە تەوە بۆ قورئان و سوننەت وەک جل شأنە ئەفەرمووێ:**

[فَإِن تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ ذَٰلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا].

## نۆیەم: بەڕێز کاک صهیب جمیل علی نوسەرو ڕۆژنامە نوس



پاش ئەوەی لە ڕێی ئیمەیڵی ماڵپەڕی بەڕێز مامۆستا جمیل علی پەیوەندیمان کرد بەبەڕێزییانەوە بۆ وەڵامی هۆکاری ڕاپرسی یەکە بەڕێز کاک صهیب ی کوڕی مامۆستا جمیل زۆر بەڕێزەوە وەڵامییان داینەوەو پێیان ڕاگەیاندین کە مامۆستا بەهۆی سەرقاڵییان بە(مرکز تحفیظ و خطبة وکەناڵی سپێدەوە ) کاتییان زۆرکەمە وەکاتی وەڵام دانەوەیان نییە هەربۆیە بەڕێزییان لە جیاتی مامۆستا جمیل بەڕێزکاک صهیب بیرۆکە یەکی جوانی بۆ ناردین ئێمەش زۆر بەدڵخۆشی یەوە بڵاومان کردەوە کە ئەمە دەقەکەیەتی:

### هۆکاری پشێوی و ناتەبایی موسڵمانان بۆچەند خاڵێک دەگەڕێنمەوە:

**یەکەمیان:** موسڵمانان بەتایبەتی ئیسلامیەکان زۆر دان بەیەکتری نانێن و هەرکەسە و بەشان و باڵی خۆیداهەڵئەڵێ و خۆی بەڕاست دەزانێت.
**دووەمیان:** هێشتا زووە بۆ دەستەجەمعی ئیسلامییەکان چونکە بیرۆکەی جیاواز لەکارو پڕۆژەکانیان بەدی دەکرێت، وەکو جیاوازی لەهەڵوێست و ئەدای سیاسیی و پەرتەوازەیی لەخیتابی سیاسییان.
**سێیەم:** رۆچوونە ناوسیاسەت و دەسەڵات وای لەئیسلامییەکان کردووە کەمتر گرنگی بەو لەیەک نزیک بوونەوە بدەن، بۆنموونە بوون بە وەزیر و پەرلەمانتار و هتد ...وای کردووە کاربەدەستی ئیسلامیی تەنها خەریکی خۆرێکخستنی بژێوی دارایی خۆی بێت و کەمتربیرو خەیاڵی بەلای دوورەپەرێزی و یەک ریزی دابێت وەکو ئەم حاڵەتە ئێستا لەنێو

بەرپرسە ئیسلامییەکانی کوردستان رەنگی داوەتەوە.

**چوارەم:** ئەگەر لایەنە ئیسلامییەکان بەردەوام بیر و خەیاڵیان بە پۆست و بەرپرسیارێتی دابێت کەمتر بیر لەبەرژەوەندی موسڵمانان دەکەنەوە وەکو لەسەرەوەش ئاماژەم پێدا.

**پێنجەم:** هۆی ناتەبایی و پەرتەوازەیی ریزی موسڵمانان و بەرروونتربڵێین ئیسلامیەکان بۆچەند خاڵێکی تردەگەڕێتەوە:

أ– بیری جیاواز وەک:

1– میانڕەوی.

2– توندڕەوی.

ب –کارکردن بۆناوبانگێتی:

1– زۆربەی ئەوبەرپرسانەی نێو ریزی ئیسلامییەکان لەخەیاڵی ئەوەدان لەرێگەی ووتارەکانیانەوە لەناوجەماوەر ناسراوبن و ببن بە قدوە کەئەم دەردە کوشندەیەش وایکردووە کەمێک بیر لەیەک ریزی نێوانیان بکەنەوە و ئیعتراف بەیەکتری بکەن.

2– خۆبەزل زانین لەئەدای ووتارو بەلاواز سەیرکردنی ئەدا وخیتابی سیاسیی بەرامبەر کەئەویش نەخۆشییەکە و یەخەی لایەنە ئیسلامییەکانی گرتووە.

3– شانازی کردن بەخەباتی رابردوو و سفرکردنی کارو پڕۆژەی لایەنی بەرامبەر.

**وەڵامی ئەو مامۆستا بەڕێزانەی کە لەڕێی کۆمەڵێک برای بەڕێزەوە داوامان لێکردبوون لەکوردستان کە ئەم راپرسی یە بخەنە بەردەستییان و گەلێک مەمنونیانم و خوا پاداشتی خێری هەموو لایەک بداتەوە.**

---

# وەڵامی هەندێک لە مامۆستایان و بانگخوازانی بەڕێزی شاری هەولێر

**ئامادەکراوە لە لایەن برای بەڕێزم:**
**کاک ڕۆژگار مسلم**

## یەکەم: بەڕێز دکتۆر عبدالله مامۆستاو بانگخواز



بسم الله الرحمن الرحيم

الحمدلله الصلاة وسلام على الرسول الله

لە ئەسڵەوە ئەگەر تەماشابکەین وەکوو ئەصڵ لە ئوممەتی ئیسلام کەوا ئەوەیە کە ئوممەتێکی یەک دەست بێت کەوەک خوای گەورە دەفەرمووێت(وَاعْتَصِمُواْ بِحَبْلِ اللّهِ جَمِيعًا وَلاَ تَفَرَّقُواْ) هەروەها چەندین فەرموودەی پێغەمبەر_صلى الله عليه وسلم_ هەیە ئیتر ئەوەیە کە ئێستا ئەو واقیعە تاڵەی کە ئێستا ئیمەی تێدا دەژین لە پەرتەوازەیی بەینی مسوڵمانان و حەتمەن ئەگەر تەماشا بکەین هۆیە سەرەکیەکەی ئەگەڕێتەوە بۆ سەر ئەوەی کەوا پیغەمبەر_صلى الله عليه وسلم_ ئاماژەی پێکردوە کەلە فەرموودەکە ئەفەرمووێ: (ثلاث وسبعين فرقة) تا کۆتایی فەرموودەکە ئیتر لێرەوە پێغەمبەر_صلى الله عليه وسلم_ باس لەو غەیبیاتانەش ئەکاتن کە خوای گەورە پێی ڕاگەیاندووە کەئەوەش دەلیلە لەسەر پێغەمبەرایەتی یەکەی وە پێغەمبەر_صلى الله عليه وسلم_ تە حدیدی

نه تیجەکەش دەکات کەوا فەرمووی(**كلهم في النار إلا واحدة**) هەمو بۆ ناو ئاگرن تە نها یەک بەش نە بێت  ئەویش کەفەرمووی(**ما أنا عليه وأصحابي**) لێرە کە تەحدیدی نە تیجەکەی کردوە وە عیلاجیشی بۆ داناوە نەتیجەکە کە ئەوەیە لەفەرموودەکە ئەفەرمووێت 72 فرقة بۆ ئاگری دۆزەخەو وە عیلاجە کەش فەرمووی تەنها یەک فرقە نە بێت کە(**ما أنا عليه وأصحابي**) کەواتە لێرەدا لە ژێر ڕۆشنایی ئەم فەرموودە پیرۆزە دەرئەکەوێت سەبەبی تەفرەقەو  پەرتەوازەیی  هەموو ئەگەڕێتەوە بۆ ئەوخاڵەی کە ئەویش دوور کەوتنەوەیە لە مەنهەج کە ئەویش قورئان و سوننەیە وە لەوانەشە بە تەئکیدی مسوڵمانان ئیدیعای قورئان و سوننە بکەن بەڵام فەهمییان بۆ قورئان و سوننە ئایا ئەو فەهمەیە کە بە فەهمی ئەهلی سەلەفی صالح ئایا بە فەهمی صەحابەو تابیعینە؟ ئەگەر ئەو فەهمە نە بێت حەتمەن خەلەل لە صواب پەیدا ئەبێت و کە خەلەل لە صواب پەیدا بوو حەتمەن ئیحتیمالی هەیە خەلەل لە ئیخیلاصیش هەبێ ئەنجا وای لی دێ هەرکەسە و حەزی لێ یەخۆی هەموو شتەک بێت و ئیتر لەم پێناوە هەموو مو شکیلەکان هەڵدە قوڵێن و هەموو عیلاجەکەش ئەوەیە گەڕانەوە بۆ سەرمەنهەج کە قورئان و سوننەیە بەفەهمی سەلەفی صالح ئەنجا بەم شێوە مسوڵمانان هەموو بۆ خوا بژین بۆ خۆیان نەژین............ والله اعلم

---

## دووەم: بەڕێز ماموٚستا سەید صەفا پێش نوێژو ووتار خوێنی مزگەوتی مەلا محموود



بسم الله الرحمن الرحيم

الحمدلله وصلاة وسلام علي خلق محمد وعلي الي وصحبة وسلم

1- دورکەوتنەوە لەڕێ و شوێن وسوننەتی پێغەمبەر( صلى الله عليه وسلم)....

2- تێکەڵ کردنی ئاینی ئیسلام بەهەندێک بیرو بۆ چوون و فەلسەفی خاچ پەرستان و بێ بڕوایان....

3- چاولێکەری کردنی بێگانە لەکارە خراپەکان و دوورکەوتنەوەو خۆبەدوور خستن لەئەنجامدانی کارە چاکەکان...

4- بەدواکەوتنی هەواو ئارەزووی خۆمان نەوەک بەدواخستنی ئارەزوو هەوامان هەروەک چۆن خواو پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) دەیانەوێ....

5- دوور چوون لە زانست و زانیاری بە پێچەوانەی ئایەتەکانی قورئان و ووتەکانی پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) کە داوامان لێ دەکەن بەدوای زانست گەری....

6- بوونی ئەمیرو سەرۆکی زاڵم و خوانەناس کەوا خەڵک دەچەوسێننەوەو دووریان دەخەنەوە لە ئاین....

7- ڕەواج دان بەکاری خراپ و ڕێگەنەگرتن لێی...

8- تەفرەقە لە مابەینی موسڵمانان و هەڵەتێگەیشتن لە دین...

..والله اعلم..

---

## سێ یەم: بەڕێز مامۆستا سەلیم شۆشکەیی پێش نوێژو ووتار خوێنی مزگەوتی عبدالله دزەیی




الحمدلله رب العالمين وصلاة وسلام على خير خلق لله محمد وعلى الي وصحبة وسلم.

طەبعەن حەقیقەتە پرسیارەکەتان لە جێگای خۆیەتی ئەمڕۆ مووسڵمانان پەرتەوازەن وناتەبان وەلەهەمان کاتیش دالاوازیشن تەقریبەن ئەم دوو پرسیارە هەردووکیان تەواو کەری یەکترین هەر کات مووسڵمان پەرتەوازەو ناتەبا بون تەنها خەریکی ئەوە بوون بەدوای عەیب و عاری یەکترو ڕەخنەلەیەکتر گرتن و بەدوو شکانی یەک ترەوە بوون ئەوکاتە لاوازوو ناتەبا ئەبن ،خاڵی لاوازیش پەیوەستە بەخاڵی یەکەم هەرکاتێک مووسڵمانان دەستیان بەرێبازی خواوە نەگرت کەخوای گەورە دەفەرموێت( وَاعْتَصِمُواْ بِحَبْلِ اللّهِ جَمِيعًا وَلاَ تَفَرَّقُواْ) هەرکات تەفرەقە بوو فەشەل و لاواز بوون لەوێوە دەست پێ ئەکات دەبنە پووش و پەلاش بەدەم باوە هەرکەس بەکەیفی خۆی دەیان بات و دەیان هێنێ عالەمی ئیسلام ئەمڕۆ

بەعام تووشی زوعفێکی وابووە کەبۆتە داشێکی دامەو بەدەستی زل هێزەکان کافروو صەلیبەکان چییان پێخۆش بێت وایان لێ ئەکات ئەوەتا بە حقیقەت دەیبینین لەفەرموودەیەک پێغەمبەر( صلی اللەعلیەوسلم)ئەفەرمویێت (لەئاخری زەمان موسڵمانان وایان لێدێت هەرکەس لەبەر خۆوە دەستیان بۆ ئەبات وتیان ئەی پێغەمبەری خوا لەبەر ئەوەی لەم رۆژە کەمین بۆیە وامان لێدێت فەرمووی نەخێر ئێوە لەو کاتەدا زۆرن بەڵام وەکوو کەفی سەر ئاوو وان هیچ سەنگ وو قودرەتان نیە ووتیان بۆ ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی لەبەر (حب الدنیا وکراهیة الموت)ژیان لایان خۆشەویست ئەبێت رقیان لەمردن ئەبێتەوە جائەگەر تەماشا بکەین ئەمڕۆ بەگشتی موسڵمان ئەوەنەی بۆ دونیا هەوڵ دەدات بۆ دین هەوڵ نادات وە هۆکارێکی تر ئەوەیە ئەگەر بش پرسی ئایا ئەهلی ئیسلام بۆچی ئەوەنە متفرقە وجیایە؟ هۆکاری سەرەکی ئەگەرێتەوە بۆ ئەوەی کەئەمرۆ موسڵمان هێزێکیان نیە لەسەر کورەی زەوی چونکە موسڵمان حەزی لەتەفەرەقەیە و حەزی لێیە بەدین خۆی بەخێووبکات وخۆی گەورە بکات وخەڵک لەدەوری خۆی کۆکاتەوە تەفرەقەو جودا جودایی دروست بکات ئەگەر هێزێک نەبوو وەک و خەلافەتی ئیسلامی بۆ چارەسەری ئەم کێشانە بێگومان رۆژ بەرۆژ زیاتر ئەبێت... وە هۆکارێکی تر ئەوەیە علماء ی ئیسلامی لە ئاستی پێویست

**دانیی یە  بۆ نموونە جامیعەی ئەزهەر لە ژێر دەستی حکومەتێکی علمانی دایە ناتوانێت فتواو قەرارێک دەربکات ئیلا ئەبێت حکومەت پێی خۆش بێت وە سەیری سعودیە بکە چەندان عولە مائی گەورەو بەڕێزی تیایە ناتوانن فتوایەک بدەن کەسوڵتەو دەسەڵات پێی خۆش نەبێت ئەمڕۆ بە عام علماء و عالەمی ئیسلامی کەوتۆتە ژێر ترس و بیم و هەیبەتی سوڵتەو دەسەڵات پێویستمان بەکەسێکی وەک ئیمامی ئەحمەدە خوا لیی ڕازیبێت کەبەرامبەر ئەم کافرانە وەستاو ئازارو ئەشکەنجە دراو لەبە ندی کرا بەڵام ئامادە نەبوو بڵێت قورئان مەخلوقە ئامادە نەبوو قەرارێکی هەڵە لەدەمی دەربچێت.. وەکاتێک عیززەتی ئیسلام دەگەڕێتەوە ئەبێ کۆمەڵە خەڵکانێک هەبن کە بجەنگن لە پێناو دینی خوای پەروەردگار..**

**وەهۆکارێکی تریش ئەوەیە ئایا بۆ چی علماء ی ئیسلام لە ژێر دەسەڵات و سوڵتە قرار بدات؟ ئەم سوڵتانە هەرخۆیان ناچارو مل کەچ کراون ئەبێ وابن چوونکە ئەوانیش ترسی ئەم کافرانەیان لەدڵە بەوهۆیەوە ئەمڕۆ سەیر بکە هەموو بیلادەکانی ئیسلام داگیر کراوە سەیرکە ئەوە عێراقەو ئەوە سۆماڵەو ئەوە ئەفغانەو ئەوە پاکستانە و ئەوە فلسطین وە لە لایەکی تر ئێران گەمارۆ دراوە هەر بە عام ئەمڕۆ عالەمی ئیسلامی لە ژێر ترس و بیمی ئەمریکادایە ئەترسن لەوە کە چۆن صەدامی ڕووخاندو**

بەڕۆژی ڕووناک پەتکی لەملی خست وە ئەوە زۆر راستە ئیسلام بە هێزو دەسەڵات و قەناعەت بڵاو بۆتەوە بەڵام هێز دیفاعی لەم بانگەوازە کردووە تاکو هێزێکی ئیسلامی نەگەڕێتەوە عیزەتی ئیسلامیش ناگەرێتەوە وە نابێت بە تەنها دووعا بکەیت خوایە ئیسلام سەرخەی ئەگەر دەستت بەکار نەخەی و وە وەسیلەیەک ئامادە نەکەی چۆن ئەبی ئەوەتاپێغەمبەر _ صلى الله عليه وسلم_ لە جەنگی بەدر کاتێ دووعای کرد کە خۆیان بۆ شەڕ ئامادەکردبوو ئەنجا هاواری خوای کردوو خوای گەورەش سەری خستن.

جا بەکورتی و موختەسەری ئەوەنە هۆکارمان لە چنگ بوو ئەگینا هۆکارەکان زۆرن ئەوانەی بۆتە هۆی پەرتەوازەیی مسوڵمانان و ناتەبایی مسوڵمانان

.. والله أعلم..

---

## چوارەم: بەڕێز مامۆستا فەتحی پێش نوێژ و ووتار خوێنی مزگەوتی عوزەیری



بسم الله الرحمن الرحيم

الحمدلله الصلاة وسلام على خلق محمد وعلى الي وصحبة وسلم

**هۆکاری بێ هێزی موسڵمانان من لەو خاڵانەدا ئەی بینم ئەوانیش بریتین لە:**

1- تێنەگەیشتنی موسڵمانان لە ناوەرۆکی ئاینی ئیسلام ئەمەش وای کردوە کە موسڵمانان زۆر بەکەمی ئاگاداری قورئان و سوننەت بن یاخود بلێین ناسینی خوای گەورە و پێغەمبەر (صلى اللەعليەوسلم) وەکوو خۆی نیە بۆ نموونە ئەگەر پرسیار لە هەندێ لە موسڵمانان بکەین زۆر بەیان نازانن ناوو صیفەتەکانی خوای گەورە چەندن و مانایان چیەو وە بەهەمان شێوە بۆ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) نایناسن و نازانن کێیە............

**2– پەرتەوازەی موسڵمانان هۆیەکی ترە ئەویش ئەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کەپشتیان لەو قورئانە کردوە بەتایبەت ئەم ئایەتە ئەوەتا خودای گەورە دەفەرموێت** (وَاعْتَصِمُواْ بِحَبْلِ اللّهِ جَمِيعًا وَلاَ تَفَرَّقُواْ)**...............**

**3– نەناسینی دۆست و دوژمن لەبەر دڵسافی خۆیان موسڵمانەکان زۆرزۆر توشی زەرەروو دواکەوتن هاتون.............**

**4– نەبوونی مەرجەعێتێکی ڕێک و پێک بۆ موسڵمانان ئێستا ئەگەر تەماشای شیعەکان بکەین ئەوان مەرجەعێتێکیان هەیە بۆیە سەرکەوتوون لە بواروو کارەکانیان دا .............**

**5– خۆشەویستی دونیاو ڕابواردن واتە: زیاتر سەرقاڵ بون بە دونیاوە هۆکارێکی زۆر گەورەیە لەسەر موسڵمانان ئەمەش ئەبێتە هۆی بیروو باوەڕ زەعیفی وبێ ئاگای لەدین زۆر زیانی تر لەسەر موسڵمان........**

**ئەنجا بۆیەک بوونی موسڵمانان پێویستە لەسەر هەموومان زیاتر هەوڵ و بایەخ بە دین بدەین نەک 99% بەدونیاوە خەریک بین 1% بەدینەوە خەریک بین پەنا بەخوا خوای گەورە یەکمان خات و عزەتی ئیسلام بگەڕێنێتەوە بۆمان و لەم پەرتەوازەیە ڕزگارمان بکات ............**

---

## پێنجەم: بەڕێزمامۆستا یەعقوب قووتابی لە کۆلێژی شەریعة



بسم الله الرحمن الرحيم

الحمدلله والصلاة والسلام علي خير خلقه محمد وعلى اله وصحبه اجمعين:::

1–لاوازبوونی باوەڕو نەبوونی یەکبوون.

2–کەوتنە ناوەوەی مرۆڤی مولحید لەناو لایەنە ئیسلامیەکان..

3–لاواز بوونی دڵسۆزی و هاریکاری نەکردنی یەکتری..

4–ڕکابەرایەتی هەندێک لەنەزانەکان لە نێوان یەکتری لەناو هەر سێ لایەنی ئیسلامیەکان ..

5–هەرکەسەو بوونی خۆی لەناو جەماوەری خەڵکی ..

6–وەرگرتنی پۆستی ئەمیرایەتی هەر یەکەو بۆخۆی بەبێ ئەوەی بزانن چی ئەکەن.

7– بەڵگەیەکی رۆشنە لە بەڵگەکانی نزیکبونەوەی هاتنی( محمدی مهدی)چونکە پێش هاتنی (محمدی مهدی)لایەنە ئیسلامیەکان هەموویان لەیەک جیاوازن و (محمدی مهدی)داوا لە هەموو سەرکردە ئیسلامیەکان ئەکاتن کە ببنەیەک دژی رۆژ ئاوا ...

**تێبینی / وە خۆم چەند جار لەهەر سێ لایەنی ئیسلامیم داوا کردوە ببنە یەک بەڵام یەکیان وەڵامی نەبوە!؟..................**

---

## شەشەم: بەڕێز مامۆستا نیظام الدین یونس عزیز پێش نوێژو ووتار خوێنی مزگەوتی حاجی یونس عزیز



**ئەم مامۆستا بەڕێزە بە زمانی عەرەبی هۆکارەکانی بۆ ناردووین ئێمەش لە بەشی خوارەوەدا کردوومانە بە کووردی**

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمدلله الصلاة وسلام علي خلق محمد وعلى الي وصحبة وسلم.......

**ملخص اسباب الفتور وضعف الايمان لدى المسلم**

1- التقصير في العبادات ب انواعها..

2- الحزبية والتعصب في التصور والاراء..

3- المجادلة في الاقوال والاعمال وعدم المصارحة..

4- عدم الاستقرار على برنامج او عمل معين..

5- الغفلة عن السنن الالهية في الامم والافراد الوارد في القران..

6- النضر الى من هو ادنى في الطاعات..

7- وقوع المسلم في معصية مما يؤدى الى ترک الجماعة واحراجة امام اقرانة..

8-عدم الاخلاص والصواب في العمل..

9-ضعف العلم الشرعي..

10- مصاحبة الهمم الضعيفة..

11-الاوهام وامراض القلوب..

12-ضعف التوكل في كل شئ..

## علاج ظاهرة ضعف الايمان

1- تجديد الايمان والاخلاص والتقوى.

2-تصفية القلوب من الامراض وطلب العلم الشرعى والمواظبة عليها.

3- فهم فقة الواقع ومنهج الوسيطة وعدم الانحراف عن منهج السلف الصالح.

4- تنظيم الوقت ومحاسبة النفس.

5- فهم الاسلام بصورة تربية شاملة وكاملة من كل جوانبها.

6- تاصيل المنطلقات والعمل وفق الكتاب والسنة.

7- التنوع في العبادات والعمل واتخاذ القدوة الصالحة.

8- ذكر الموت.

9- المثابرة والصبر ونقد الذات والنقد البناء تجاه الاخرين.

10- النظر في سيرة الانبياء والصالحين.

---

واتای بەکووردی:

**پوختە ی هۆکارە کانی سارد بونە وە و بێتا قە تی و لاوازی باوە ڕ لای مسوڵمان.**

1- کە م تە رخە می لە پە رستنە کاندا بە هە مو جۆرە کانیە وە..

2- حزبایە تی و دە مارگیری لە پێشبینی و راو بۆچوندا..

3- موجادەلە کردن لە وتە و کردە وە دا بە بێ دەربڕینی ئەسڵی کێشەکە..

4- جێگیر نەبوون لە سەر بەرنامەیەک یان کارێکی دیاری کراو..

5- بێ ئاگابون لە سوننە تی خوایی لە سە ر ئوممەت و تاک کە لە قورئاندا هاتووە..

6- سە یر کردنی ئە وکە سانە ی کە نزم ترن لە گوێرایەڵی و پەرستنەکاندا..

7- وە کە وتنە ناو هە ڵە و تاوان مسوڵمان وای لێ ئە کات واز لە کۆمەڵکاری بێنێ و شە رمە زارئەبێت لە بەردەم کەسە نزیکەکانی..

8– نه بوونی نیاز پاکی (ئیخلاص) و پاداشت له کاردا..
9– لاوازی له زانستی شه رعیدا..
10– هاوڕێیەتی کردنی کەسانی ورە ڕووخاو لاواز..
11– ڕاڕای و وە سوەسەو نە خۆشیە کانی دڵ..
12– لاوازی تە وە کول (بەخوا بوون ) لە هەموو شتێکدا..

---

## چارە سەری دیاردەی لاوازی باوەر

1– تازە کردنەوەی باوە ڕو نیاز پاکی و پارێزکاری.
2– پاکژ کردنەوەی دڵ لە نەخۆشی وە هەوڵ دان بۆ فێربوونی زانیاری شەرعی و وە پابەند بوون پێوەی.
3– تێگەشتن لەو حاڵەتەی کە تێیدا دەژیت گرتنە بەری بەرنامەیەکی ناوەندی و لانەدان و پشت نەکردن لە سەر بەرنامەو ڕێبازی پیاوچاکانی پێشوو.
4– ڕێکخستنی کاتەکان و لێپرسینەوە ی نەفس.
5– تێگەشتن لە ئیسلام بە شێوەی پەروەردەیی گشتی و تەواوەتی لە هەموو لایەنەکانی یەوە.
6– گەرانەوەی کار بۆ سەرچاوە ئەصلەکەی دەست پێ کردنی کار کردن بە پێی قورئان وسونەت لەوێوە.
7– کردنی هەموو جۆرە کانی کردەوەو پەرستنەکان وە پیاو چاک کردنە پێشەنگ.
8– زۆر یاد کردنی مردن.
9– بەردەوام بوون و ئارام گرتن و خۆ بەکەم زانین لە خۆتدا وخۆبەکەم زانین بەرامبە ر خەڵکانی تر.
10– لەبەرچاو گرتن و خوێندنەوەی ژیاننامەی پێغەمبەران و پیاوچاکان.

---

## حەوتەم: بەڕێز ماموستا شێرزاد ماموستاو بانگخوازی ناوداری شاری هەولێر



بسم الله الرحمن الرحيم

الحمدلله الصلاة وسلام على خلق محمد وعلى اله وصحبه اجمعين:

**دوجۆرە هۆكارن:**

1- هۆكاری دەرەكی

2- هۆكاری ناوەكی

**یەكەم: هۆكارە دەرەكی یەكان**

1- ئەو پلانانەی كە دووژمنانی ئیسلام دایدەنێن بۆ پەرتەوازەكردنی موسڵمانان.

2- ئەوحاڵەتە سیاسی یە نا ئارامەی كە دووژمنانی ئیسلام دروستی ئەكەن لەووڵاتی موسڵمانان.

3- دەست تێوەردانی دووژمنانی ئیسلام لەكاری سیاسی و ئابوری موسڵمانان بەشێوەی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ.

4-دانانی ئەڵقە لەگوێ و بەكرێ گیراوانی خۆیان بۆ حوكمڕانی ولێدانی موسڵمانان و درووست كردنی بەربەست لەبەردەم پێشكەوتنییان.

5- دانانی سیستەمی ئابووری بەسوود لەسەرموسڵمانان لەكاتی مامەڵەكردنییان لەگەڵ كەلوپەلە هەناردەو هاتووەكاندا.

6- بڵاوكردنەوەی ئەفكارو ڕاوبۆچوونی زۆر ژەهراوی بەناو مسوڵمانانداا بەناوی مافی مرۆڤ و مافی ئافرەت و ئازادی بیرو ڕا..... هتر

7-ئاسان كاری بۆ بەدەست هێنان و بەكار هێنانی ئەو ئامێرە پێشكەوتوانەی كە بە شێوازی خراپ بەكار ئەهێندرێت.

8-ڕەواج دان بەدین و مەزهەبە شێواو و بەسەرچووەكان لەناو مسوڵمانان دا بە ناوی زیندوو كردنەوەی كەلە پوور.

<<<<<<<<<<<<>>>>>>>>>>>

## دووەم : هۆكارە ناوخۆی یەكان

1- تێنەگەشتن و یان تێگەشتنی سەقەت لەدینی خوای گەورە كەخۆی ئەبینێتەوە لەقورئان و سونەت.
2- هەبوونی تێڕوانینی جودا لەدەقە شەرعی یەكان دا.
3- قەبوڵ نەكردنی ڕای بەرامبەر ئەگەر لەسەر حەقیش بێت.
4- هەبوونی عیقدو كینە لەدڵی موسڵمانان یان هەبوونی هێلانەی شەیتانەكان لەدڵی موسڵماناندا.
5- تێڕوانینی جودا بۆچارەسەركردنی كێشەكانی نێو موسڵمانان.
6- پەیوەست بوو بە ئەشخاص و دەمارگیری بۆیان.
7- پەیوەست بوون بەچەند دەقێك و لانەدان لێیان.
8- تێڕوانینی زۆرتەسك و بچووك بۆ دەقە شەرعییەكان.
9- پەرژەوەندی پەرستی ماددی چ زەعامەتی.
10- دووری لە نەخشە كاری و بێ بەرنامەیی.
11- دەمارگیری بۆ مەزهەبێك یان بۆ ئیمامیك یان بۆ كۆمەڵێك.
12- ظن بردن بەوەی كە تەنها كۆمەڵی تۆ لەسەر حەقن.

## هەشتەم: بەڕێز مامۆستا ئیسماعیل سۆسەیی مامۆستاو بانگخوازی ناوداری شاری هەولێر



بسم الله الرحمن الرحيم

الحمدلله والصلاة والسلام على رسول الله وعلى اله وصحبه ومن والاه اما بعد:

**ئەوخاڵانە هەندێکن لەسەبەب و هۆکارەکانی لاوازی موسڵمانان لەم سەردەمە:**

1- جێ بەجێ نەکردنی فەرمانەکانی خواو پێغەمبەری پێشەوامان(صلى الله عليه وسلم) قال تعالى(وَأَطِيعُواْ اللّهَ وَرَسُولَهُ وَلاَ تَنَازَعُواْ فَتَفْشَلُواْ وَتَذْهَبَ رِيحُكُمْ وَاصْبِرُواْ إِنَّ اللّهَ مَعَ الصَّابِرِينَ) (الأنفال آية 46) واتە: گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خواو پێغەمبەرەکەی(صلى الله عليه وسلم) بن کێشەو دووبەرەکی مەنێنەوە چونکە لاواز دەبن هێزتان نامێنێ.

2- خۆشەویستی دونیا و ڕق لێ بوونەوە لەمردن:

قال رسول الله(صلى الله علية وسلم) « يُوشِكُ الأُمَمُ أَنْ تَدَاعَى عَلَيْكُمْ كَمَا تَدَاعَى الأَكَلَةُ إِلَى قَصْعَتِهَا ». فَقَالَ قَائِلٌ وَمِنْ قِلَّةٍ نَحْنُ يَوْمَئِذٍ قَالَ « بَلْ أَنْتُمْ يَوْمَئِذٍ كَثِيرٌ وَلَكِنَّكُمْ غُثَاءٌ كَغُثَاءِ السَّيْلِ وَلَيَنْزِعَنَّ اللَّهُ مِنْ صُدُورِ عَدُوِّكُمُ الْمَهَابَةَ مِنْكُمْ وَلَيَقْذِفَنَّ اللَّهُ فِى قُلُوبِكُمُ الْوَهَنَ ». فَقَالَ قَائِلٌ يَا رَسُولَ اللَّهِ وَمَا الْوَهَنُ قَالَ « حُبُّ الدُّنْيَا وَكَرَاهِيَةُ الْمَوْتِ ».

رواه ابوداود و احمد وابونعيم حديث صحيح

کەواتە/ بەدیار کەوت لەم فەرموودەیە کەهۆی بێ هێزی موسڵمانان بەو ئەندازەی دەگەن کەهەموو دووژمنان لەگەڵ خەڵکانی سەر ڕووی زەوی

**دەورییان لێبدەن و پێیان بوێرن و زاڵ بێت بەسەریان خۆشەویستی دوونیاو ڕق بونەوە لەمردن!!!!**

**3– وازهێنان لەجەنگ و جیهاد و دەست گرتن و سەرقاڵ بوون بەدوونیا:**

**قال الرسول الله (صلى الله علية وسلم) : (إذا تبايعتم بالعنية" ورضيتم بالزرع وأخذتم أذناب البقر "وتركتم الجهاد في سبيل الله "سلط الله عليكم ذلا لاينزعه حتى ترجعوا الى دينكم) سلسلة الاحاديث الصحيحه.**

**4– لاوازی ئیمان و باوەڕ تەواو نەبوونی دۆستایەتی دووژمنایەتی لە پێناو خوا:**

**خوای گەورە بە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ئەفەرموویێت:** (وَلَوْلاَ أَن ثَبَّتْنَاكَ لَقَدْ كِدتَّ تَرْكَنُ إِلَيْهِمْ شَيْئًا قَلِيلاً(74) إِذاً لَّأَذَقْنَاكَ ضِعْفَ الْحَيَاةِ وَضِعْفَ الْمَمَاتِ ثُمَّ لاَ تَجِدُ لَكَ عَلَيْنَا نَصِيرًا(75) **(الإسراء 74 – 75) واتە: ئەگەر ئێمە تۆمان جێگیر نەکردبا ئەی محمد(صلى الله عليه وسلم) نزیک بو مەیلێکی کەم بۆ موسڵمان بوونی بێ بڕواکان بکەی بۆلایان ئەوکاتێ دوو هێندەی خەڵکی لە دوونیا و دواڕۆژ ئازارمان دەدای و لە پاشان پشتگیری ئێمەت نەدەما.**

**5– دەمارگیری و(تعصب) بۆ راو بۆچونەکانی مرۆڤ و کەس و کۆمەڵ و تاقم............ پەرتەوازەیی و کۆمەڵ بوون.قال تعالى** (وَاعْتَصِمُواْ بِحَبْلِ اللّهِ جَمِيعًا وَلاَ تَفَرَّقُواْ) **ال عمران(103)**

**تەنها لایەنگری و پێداگرتن لەسەر پەت و ڕشتەی خوایی دەبێ بۆ خوای دەبێ وە لە ئایەتێکی تر خوای گەورە ئەفەرموویێت:** (وَلاَ تَكُونُواْ كَالَّذِينَ تَفَرَّقُواْ وَاخْتَلَفُواْ مِن بَعْدِ مَا جَاءهُمُ الْبَيِّنَاتُ ..) **ال عمران(105)**

**6– هەموو گوناهو تاوانەکان و شوێن کەوتەبوونی خوت خوتەی شەیتان.**

**7– جاهیل بوون و عیلم نەبوونی تەواو بەخواو ئاینی خوا و ڕێبازی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم).**

**8– پیلان و دووژمن کاری دووژمنانی ئیسلام و سەرلێ شێواندنی موسڵمانان و داگیر کردنی بیرو هۆشیان و دەست خستنە ناو کاروباری**

موسڵمانان چ بە ڕاستەوخۆ یابەناڕاستەوخۆ لەڕێگای بەکرێگیراو کلکە کانییان لە نێو خاک و کۆمەڵگای موسڵمانان....

---

## نۆیەم: بەڕێز  مامۆستا ووریا پێش نوێژو ووتارخوێنی مزگەوتی مصعب ی کوری عومەیر

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمدلله وصلاة وسلام على خلق محمد وعلى اله وصحبيه وسلم اجمعين:::::

1- تێگەیشتنی قورئان و حەدیس بەتێگەیشتنی خۆیان نەک بە تێگەیشتنێک بێت کەبەفەهمی سەلەف...
2- پەروەردەنەکردنی خۆیان و هەموو خەڵک لەسەر ئیسلامەتی راستەقینە...
3- حزبایەتی کردن لەسەر حیسابی ئیسلام
4- بانگەواز کردنی خەڵک زیاتر بۆ حزبایەتی نەوەک بۆ ئیسلام ...
5- پاک نەکردنەوەو پەروەردەنەکردنی خۆیان و غەیری خۆیان لەسەر تەوحیدو سوننەت...
6- دوور نەکەوتنەوە لەشیرک و بیدعە...

---

## دەیەم: بەڕێز مامۆستا سابیر پێش نوێژو ووتار خوێنی مزگەوتی تەقوا



**بسم الله الرحمن الرحيم**

**الحمدلله وصلاة وسلام على خلق محمد وعلى اله وصحبه وسلم اجمعين:**

**1- دوورکەوتنەوەی موسڵمانان لە ئاینی پیرۆزی ئیسلام.**
**2- زۆربوونی هۆکاری تێکدانی ئەخلاقی گەنجان لە ڕێگای ڕاگەیاندنی خراپ وەک _ سەتەلایت_..........**
**3- نەبوونی حکومی ئیسلامی لەسەرانسەری جیهانی ئیسلامی.**
**4- زۆربوونی خۆشیەکانی دونیا..........**
**5- تێکەڵاوبوونی هەردوو ڕەگەز(نێرومێ) بەتایبەتی لە کۆلێژوو پەیمانگاکان..........**
**6- جێ بەجێ نەکردنی بەها پیرۆزەکان وەک ڕاستگۆیی و بەجێ نەگەیاندنی بەڵێن و ئەمانەت و دەست و دەم و داوێن پاکی..........**
**تێبینی: بەڵام لەگەڵ ئەمانە شدا نابێ(ڕەشبین) بین لەبەر ئەوەی خەڵک بەبۆچوونی من زۆر باشە. ئەوانەی خراپن زۆر کەمن بەڵام خراپ زەقەو زووديار ئەبێت و وەباشە درەنگ بەدەر ئەکەوێت...**
**ئیتر لەخوای پەروەردگار دەپاڕێمەوە خراپەکانمان باش بکات و باشەکانمان باشتریش بکات لەگەڵ ڕێزی تایبەتیم بۆ هەموو لایەک..........**

---

كۆمەڵێک لە مامۆستایان و بانگخوازانی بەڕێزی شاری سلێمانی

**ئامادەكراوە لە لایەن برایانی بەڕێزم:**

**كاك باوكی ڕامان**

**كاك شاهۆ عمر**

**كاك كوڕی ئیسلام**

**یەكەم: بەڕێز شێخ فاتیح دارۆغایی مامۆستاو بانگخوازی ناوداری شاری سلێمانی**



هۆكاری جیاوازی موسوڵمان

**دوو هۆكاری سەرەكی هەن بۆ جیاوازی نێوان موسڵمانان**

یەكەم :- هۆكاری رەوتی :

ئەم هۆكارە بەلای زانایانی ئیسلامەوە پەیوەندی هەیە بەوسیفەتەخراپانەی كە بەهۆی دەرونی سەركەشی مرۆڤەكانەوەوزیاد بوونی ئەوسیفەتە خراپانە وە لەئادەمیزادا درووست دەبێت جیاوازی لەنێوان موسڵمانان دا درووست دەبێت .

لەوسیفەتە خراپانە :-

1- خۆپەسەندی و لەخۆبایی بوون .
2- گوومانی خراپ بەیەک بردن و تاوان بارکردنی یەکتری بەبێ بەڵگە.
3- خۆویستی و خۆدەرخستن و حەزکردن لە پلەوپایە
4- دەمار گیری بۆ وتەی زانایەک یان ڕێبازێک یان لایەنێک یان هیتد.......
5- دەمار گیری بۆ وڵاتێک یان هەرێمێک یان شارێک ئەمانە هەر هەمووی لەسیفەتە خراپەکانن و زانایانی دڵ بێدارو دەرون ناس بەفەوتێنەرەکان ناویان هێناوەو بۆ خۆدەرباز کردن لەم سیفەتانە پێویستە موسڵمانان هەوڵی پاک کردنەوەی دەرون بدات بەپەرستشەکان بەتایبەت ئەوکاتە بەپاک کردنەوەی دەروون و بەرزبونەوەی ئاستی ئیمان سیفەتەخراپەکان کەم دەبنەوەو سیفەتەبەرزو جوانەکان زیاد دەکات و بەم شێوەیەیش هۆکارەکانی جیاوازی ناتەبای کەم دەبنەوە .

دووەم:- هۆکارە فیکریەکان :

ئەم هۆکارانەن

بوونی جیاوازیە لەراو بۆچونی موسڵمانان لەو پرسانەی کە دەقێکی شەرعی لەسەر نەهاتوەو نەی بڕیوەتەوە واتە پرسە فەرعێکان وەک بەشداری موسوڵمانان لەپرۆسەی هەڵ بژاردن و چونی پەرلەمانیان هاوو پەیمانی لەگەڵ لایەنە نائیسلامیەکان دا.

## دووەم: بەڕێز مامۆستاهاوڕێ محمد ئەمین مامۆستای زانکۆی خوێندنی ئیسلامی(زانستە شەرعی یەکان) مامۆستاو بانگخوازو کەسایەتی ناوداری کوردستان



الحمدالله وصلى الله على محمد رسول الله وعلى اله وصحبه ومن والا:

**من پێم وایە گرنگترینی ئەوهۆکارانە ئەم خاڵانەی لای خوارەوەن**:-

1- ئەو مەنهەجەی ئەمڕۆ موسڵمانانی لەسەر پەروەردەدەکرێت لێڵ و نادروست و سەقەتەو دوورە لەقورئان و سیرەتی محمد(صلى الله عليه وسلم) ، ئەمە جگە لەوەی کەدەیان مەنهەجی جۆراوجۆر لەیەک کاتدا ڕیزی موسڵمانانی کەرت و پەرت کردووە.

2- نەبوونی قیادەو سەرکردەیەکی شیاو کەلەئاستی ئاستەنگەکانی سەردەم دا بێ و بتوانێ موسڵمانان لەژێرچەتری خۆیدا کۆبکاتەوە.

3- هێندەی کە موسڵمانان دژایەتی یەکتر دەکەن نیو هێندە دووژمن دژایەتییان ناکات، هۆکارەکەشی جیاوازی یە لەو مەنهەجەی کەهەرکۆمەڵ و گرۆیەکی لەسەر پەروەردەکراوە.

4- خۆ یەکلایی نەکردنەوەی موسڵمانان بۆکاری ئیسلامی و خزمەتی ئاینەکەیان وەباوەش کردنییان بەدوونیاداو لەبیرکردنی قیامەتییان(حب الدنيا وكراهية الموت).

والسلام عليكم

---

## سێ یەم: بەڕێزماموٚستا خلیل عثمان نوسەرو بانگخواز

هۆکاری ئەم پشێویی و ناتەبایی یە دەگەڕێنمەوە بۆ ئە و فەرموودەیەی پێغەمبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) کە دەفەرموویێت: (حب الدنیا وکراهیة الموت).

---

## چوارەم: بەڕێز ماموٚستاعبدالکریم پێش نوێژو ووتارخوێنی مزگەوتی ئیمان کەسایەتی ناوداری سەلەفی لەکوردستان

هۆکاری ئەم پشێویی و ناتەبایی یە دەگەڕێنمەوە بۆ پابەند نەبونی موسڵمانان بە قورئان و سوننەتەوە.

---

## پێنجەم: بەڕێز ماموٚستا جووتیار ماموٚستاو شاعیری ئیسلامی

هۆکاری ئەم ناتەبایی و پەرتەوازیی یە گرنگی نە دانی موسڵمانان بە ناوە ڕۆکی ئیسلام وسە رقاڵ بوون بە شتە لا وە کی یە کانە وە یە.

---

## شەشەم: بەڕێز ماموٚستا لقمان ئەحمەد پێش نوێژی مزگەوتی گەورەی عەربەت

هۆکەی پشت کردن لەبەرنامەی پاکی ئیسلام و نەبوونی پێشەوای ڕاستەقینە **قال تعالی**:( وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَةً ضَنكًا....)سورة:طه:124.

---

## حەوتەم: بەڕێز مامۆستا باوکی ڕامان بانگخوازو نوسەر

هۆکەی دەگەڕێتەوە بۆ چەند خاڵێک لەوانە:

1– نەبوونی بانگخوازێکی ڕاستەقینە.

2– وتەو کردار تەواوکەری یەکتر نەبوون.

3– خۆ بەزل زانین و دوورکەوتنەوە لەڕیزی موسڵمانان.

خوای باڵا دەست لەهەمووان خۆش بێت و کردارو ڕەفتارمان جوان خاسکات چونکە هەرزاتی کارجوان و زانایە** والسلام علیکم ورحمة الله وبرکاته**

---

## کۆمەڵێک لە مامۆستایان و بانگخوازانی بەڕێزی دەڤەری بتوێن و پشدەر

### ئامادەکراوە لە لایەن برای بەڕێزم:

### کاک باوکی سومەییە

**یەکەم : بەڕێز مامۆستا عبداللطیف أحمد مصطفی ناسراو بە(باوکی عبدالحمید) ووتار خوێنی مزگەوتی گەورەی چوارقوڕنە، یەکێک لە مامۆستاو کەسایەتی یە ناودارەکانی سەلەفی لە کوردستان**



بسم اللهالرحمن الرحيم

الحمد لله رب العالمين الصلاة والسلام على نبيينا وحبيبنا محمد(صلى اللهعليهوسلم) وعلى الهوأصحابهومن تبعهم بإ حسان إلى يوم الدين.

أما بعد

**هۆکاری لاوازی موسوڵمانان**

**یەکەمیان:** لاوازی ئیمانی موسڵمانان هۆکاری فەشەل و دۆڕان و زەلیل بوونی موسوڵمانانە وە ک خوای گەورە فەرموویەتی: (وَلاَ تَهِنُوا وَلاَ تَحْزَنُوا وَأَنتُمُ الأَعْلَوْنَ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ) (139 – ال عمران) واتە: ئێوە لەسەرەوەن و سەرکەوتون ئەگەر ئیمانداری تەواو بن.

کەواتە تاکو ئیمان تە واو پتەو تر بێت ئەوە موسوڵمانان زیاتر سەربەرزو سەرکەوتو دەبن،وە بە گوێرەی لاوازی ئیمانییان سەرکەوتووییان دادەبەزێت.

**دووەمیان:** ناکۆکی و دووبەرەکی و تەفرەقە و حیزبایەتی هۆکارێکی

**سەرەکی فەشە ل و لاوازی موسڵمانانە وە ک خوای گەورە دەفەرموویت:**
(**..**وَلاَ تَنَازَعُواْ فَتَفْشَلُواْ وَتَذْهَبَ رِيحُكُمْ**..**) ( **الأنفال – 46**) **.**
**سێهەمیان: ڕۆ چوون لە دونیاداو مەشغوڵ بوون بە بازرگانی و زەراعەت و واز هێنان لە تێکۆشان لە ڕێگای خوا بە نەفس و بە ماڵ و بەزمان هۆکاری تری زەلیلین وەک و پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) دەفرموویت: (إذا تبایعتم بالعنیة" ورضیتم بالزرع وأخذتم أذناب البقر "وترکتم الجهاد في سبیل الله "سلط الله علیکم ذلا لاینزعه حتی ترجعوا الی دینکم) واتە: ئەگەر ئەم چوار سیفەتە لەناو موسڵمانان دا هەبوو ئەوە خوای گەورە زەلیلیان بەسەردا زاڵ دەکات وە لەسەریان لانابات تاوەک و بەتەواوی نەگەڕێنەوە بۆ لای دینەکەیان.**
**کە بەرزترین پلەی دینیش تەوحیدو تەنها خوا پەرستی یە دوایش شوێن سونە ت کەوتنەو نوێژ کردن و زەکات و فەرمان بە چاکەو نەهی لە خراپەیە.**

**والحمد لله رب العالمین**

---

## دووەم: بەڕێز ماموٚستا ئەحمەد رەسول خدر   ناسراو بە ماموٚستا ئەحمەدی سپی سینە موٚکی پێش نوێژو ووتارخوێنی مزگەوتی قەندیل لەچوار قورنە



بسم اللهالرحمن الرحيم

الحمد لله رب العالمين و الصلاة والسلام على رسول الأمين سيدنا وحبيبنا  محمد(صلى اللهعليهوسلم) وعلى الهوأصحابه الطيبين الطاهرين ومن تبعهم بإ حسان إلى يوم الدين.

### ب/ هۆكارەكانی لاوازی و پەرش و بڵاو بوونی موسڵمانان .

دیارە نیشانەی تەندروستی و ساغی نەتەوەی ئیسلام یەكبوون و خۆشەویستی و برایەتی یەو بە پێچەوانەشەوە پەرش و بڵاوی و ناكۆكی و ماڵ ماڵێنە نیشانەی نە خۆش و دەردە داری یەو حاڵەتیكی نائاسایی یە چونكە خوای گەورە دەفەرموویێت:( إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ فَأَصْلِحُوا بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ) (الحجرات – 10) یان دەفەرمووێت : (وَاعْتَصِمُوا بِحَبْلِ اللَّهِ جَمِيعًا وَلَا تَفَرَّقُوا) (ال عمران–103) ئەمەو چەندین ئایەت و فەرموودەی تر جەخت لەسەر ئەوە دەكەن كە موسڵمانان دە بێت دۆست و پشتیوانی یەكتر بن بێ ئاگا نەبن لە یەكترو بێخەم نەبن لە گرفتە كانی یەكتر دەنا هێزو پێزییان نامێنێت. هۆكارەكانی ئەو دەردی لاوازی و پەرتەوازی یەش زۆرن بەلاّم گرنگتریان بەڕای من لە دوو شتی سەرەكیدا كوورت دەبێتەوە.

1 – هۆکاری یەکەم/ نەبوونی چەق و مەرکەزێک بۆ موسڵمانان کە موسڵمانان لە دەوری کۆببنەوە وە کێشەو گرفتەکانییان بگێڕنەوە بۆ لای وە بە یەکەوە مشوری دونیای ئیسلام بخۆن کە ئەویش خۆی لەدەسەڵاتی سیاسی دا دەبینێتەوە دەبینین هەموو کێشەو گرفتە کانی جیهانی ئیسلامی کە بۆتە هۆی پارچە پارچە بوونی لەوەوە سەرچاوەی گرتوە و هەر ڕۆژەی کێشەیەک سەرهەڵدەدات بێ ئەوەی کێشەی پێشتر چارەسەر بکرێت، جیهانی ئیسلامی بۆتە شوێنی ناکۆکی و شەڕو کوشتارو کەڵەکە بوونی کێشەو گرفتەکان لەسەرو هەمووشیانەوە کێشەی( کوردو کێشەی فەلەستین) کە گومانی تێدا نی یە هەردوو کێشەکە لەدوای نەمانی دەسەڵاتی ئیسلامی لە تورکیا کە بە خەلافەتی عوسمانی ناسراوە سەریان هەڵدا کەبەدەستی زلهێزانی تەماع باز لە ناو براو پاشان نەتەوەی ئیسلام پارچە پارچە و پارو پارو کرا بۆ ئەوەی بە ئاسانی خێرو بێرەکەی قووت بدرێت هەربۆیە لە ئیسلام دا مەسەلەی دەسەڵات و فەرمان ڕەوایی یەکێکە لەمەسەلە زۆر گرنگەکان و دەس بەرداربوون لێی تاوانەو نیشانەی بێخەم بوون و گوێنەدانەبە کێشەو گرفتی مسوڵمانان کە ئەوەش لەگەڵ دروشمی برایەتی دا ناگونجێت ، هەربۆیە کاتێک پێغەمبەری خوا(دروودی خوای لەسەر بێت) کۆچی دوایی دەکات تەرمی پیرۆزی نانێژرێت هەتا خەلیفە دیاری نەکرێت کە (ئەبوبەکری صدیق) ە ڕەزای خوای لێبیت، خوای گەورەش دەفەرمووێت(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُولِي الْأَمْرِ مِنْكُمْ فَإِنْ تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ إِنْ كُنْتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ ذَلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا) ( النساء – 59) خوای گەورە لەم ئایەتەدا فەرمان دەکات دوای گوێڕایەڵی بۆ خواو پێغەمبەری خوا(دروودی خوای لێبیت) پێویستە گوێڕایەڵ فەرمان ڕەوای موسڵمانانیش بکرێت ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە نە لە قورئان دا و نە لە مێژووی ئیسلام دا ئیسلامێک نی یەو نەناسراوە کە جیا بێت لەدەسەڵات و وە ڕێگەش نەدراوە دەسەڵاتێک بە پێی شەرعی خوا بە ڕێوە بچێت و گوێڕایەڵیش نەکرێت کەواتە ئەوە دەبێتە چەقێک و موسڵمانان

**لەدەوری کۆدەبنەوە.**

**2 – هۆکاری دووەم/ تێنەگەشتنی موسڵمانان لەناوەڕۆک و واتای عیبادە ت و پەرستشەکان یان گوێ نەدان بەولایەنە کاتێک وورد دەبینەوە لە واتاو مەبەستی پەرستشەکان(نوێژ، ڕۆژوو، زەکات، حەج) دەبینین هەریەکێک لەوانە چەندین ماناو واتایی جوان جوانی لە ناو خۆدا هەڵگرتوە کە یەکێکییان بریتی یە لەواتای جەماعی بووناو بەیەکەوە بوون بۆنموونە:**

**1 – نوێژ/ داواکراوە بەکۆمەڵ لەمزگەوتێ ئەنجام بدرێت شە وو ڕۆژ پێنج جار خۆ ئەگەر واجبیش نەبێت خێری زیاترە لە نوێژی تاک لە ماڵێ بە بیست و حەوت پلە(27) کەئەوەش بەڕونی ئەوە نیشان دەدات کە دەبێت موسڵمانانی هەرگەڕەکێک لە هەر شارێک یالەهەر گوندێک پەیوەندی یەکی بەردەوامیان بەیەکەوە هەبێت و ساتێک نەبێت لەیەک بێ ئاگا بن کاتێک سەیری نوێژی هەینی دەکەین لە هەفتەی یەکجاردا دەبینین بازنەی پەیوەندیەکە فراوانتر دەبێت و ئەنجام دانیشی بە کۆمەڵ کراوە تە واجب ڕێگەی بەشداری نەکردنی نەدراوە مەگەر بۆ خاوەن عوزرەکە ئەوەش نوێ بوونەوەو زیندبوونەوەی برایەتی یە وە نیشاندانی هێزو توانا یەو لەگەڵ گوێگرتن لە چەند ووتەیەکی جوان و بەسوود پاشان کەسەیری نوێژی جەژنەکان دەکەین جەژنی ڕەمەزان و قوربان بازنەکە فراوانتریش دەبێت و ئیسلام دەیەوێت لە ئەنجام دانی ئەم نوێژەدا کۆنگرەیەکی گشتگیرو میهرەجانێکی گەورە دروست بێت کە هەموو خەڵکی شار بە ژن و پیاوەوە پیرو گەنج و منداڵەوە تەنانەت ژنانی بێ نوێژیش لەیەک شوێن کۆ ببنەوە ئەوەش ساڵانە دووجارە خۆ ئەگەر بەتەنهاش نوێژ بکرێت کەسی نوێژ خوێن هەربەهەستی جەماعی یەوە نوێژ دەکات و سیغەی ووشەکان هەر بە کۆ دەخوێنێت و دەڵێت:**

(إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ) **بۆ نموونە.**

2– ڕۆژو/  یەکێک لە بەرهەم و  واتاکانی ڕۆژوش دروست بونی هەستی کۆمەڵایەتی و بەیەکەوەبوونە چونکە هەموو موسڵمانان لە یەک کاتدا دەست لە خواردن و خواردنەوە هەڵدەگرن و لە یەک کاتیشدا دەست دەکەنەوە بە خواردن و خواردنەوە وە هەروەها هەستی کۆمە کی و ئاوڕ دانەوە لە هەژاران لە دڵی دەوڵە مەندان دا دروست دەبێت کاتێک بۆ ماوەیەک دەست لە خواردن هە ڵدەگرن و دەزانن دەردی هەژاری چ دەردێکی گرانە.

3– زەکات/ زەکاتیش یەکێکە لە واتاکانی پاک بوونەوەیەکی دوو لایەنەیە کە هەم دەوڵەمەندەکە پاک دەبێتەوە لە ڕژدی و ڕەزیلی ماڵ پەرستی هەم هەژارەکەش لە دەردی ئێرەی و ڕق و کینە ڕزگاری دەبێت کە ئەوەش یەکسانە بەدروست بوونی هەستی برایەتی و خۆشەویستی لە نێوان هەژار و دەوڵەمەند داو کێشەی چینایەتیش چارەسەر دەکات .

4– حەج/ حەجیش فراوان ترین بازنەی برایەتی و خۆشەویستی نیشان دەدات دەتوانین بڵێین کۆنگرەیەکی ساڵانەی جیهانییە کە هەموو ساڵێک دووبارە دەبێتەوە لە هەموو شوێنێکی ئەم جیهانەدا موسڵمانان نوێنەریان لەوێ یە کە ئەوەش دەبێتە مایەی ئاشنا بون و تعارف لە نێوان هەموو موسڵمانانی جیهان  و هەست کردن بەوەی  کە موسڵمانان هەموویان  پشت و پەنای یەکن و خۆشەویستی یەکن وە هەموویان یەک بەرگیان پۆشیوە وە یەک دروشمیان بەرز کردۆتەوە کە (**لبیک اللهم لبیک**) وە هەموویان یەک خولگەیان هەیەو بەدەوری دا دەخولێنەوە کە ( کەعبەی پیرۆزە) کە ئەوەش مەعنای نەفرەت کردنە لە دەمار گیری و جیاوازی.

**کاتێک ئێمە بێین لەم روانگەیەوە سەیری ئیسلام و بە تایبەت لایەنە پەرستشەکان بۆمان دەردەکەوێت کە ئەگەر بە ڕێک و پێکی و بە تێگەیشتنەوە جێ بە جێ بکرێت یەکسەر نەتەوەیەکی زۆر بە هێزو پڕ لە سۆز و خۆشەویستی دروست دەبێت و کێشەو گرفتەکانیش زۆر بە ئاسانی چارەسەر دەبن ئەمە ڕاستییە کە دووژمنانی ئیسلاممان دانیان پێدا ناوەو مەترسی خۆیان لە بەرامبەر دەر بڕیوە بۆ نموونە یەکێک لە موژدەدەرانی مەسیحی لە راپۆرتێکی دا لە سەر بارو دۆخی جیهانی ئیسلامی ئامادەی کردبوو دەڵێ : ئیسلام دەبێتە تاشە بەردێکی زۆر سەخت لە بەردەممان داو کەشتی موژدەدەرانی مەسیحی تێک دەشکێنێت هەتا موسلمانان خاوەنی ئەو چوار کۆڵەکەیەن (قورئان ، زانکۆی ئەزهەڕ ، کۆبونەوەی هەفتانەی هەینی ، کۆنگرەی ساڵانەی حەج).**

**والسلام علیکم ورحمة الله وبرکاته**

---

## سێیەم: بەڕێز مامۆستا علی عبدالرحمن پیش نوێژو ووتارخوێنی مزگەوتی چۆمان لە چوارقورنە



بسم اللهالرحمن الرحيم

الحمد لله رب العالمين و الصلاة والسلام على رسول الأمين سيدنا وحبيبنا محمد(صلى اللهعليهوسلم) وعلى الهوأصحابه الطيبين الطاهرين ومن تبعهم بإ حسان إلى

يوم الدين.

بێگومان ئەوەی بیرمەندانی ئیسلامی ئەمڕۆی سەرقاڵ کردووە ئەوەیە ئایا هۆی دواکەوتوی و لاوازی و جیاوازی و پەرتەوازەیی موسلمانان و هۆکاری زاڵ بونی دوژمنانیان چییە بە سەریاندا. ئەوە دەتوانین چەندین هۆکار دەسنیشان بکەین کە گرنگترینیان ئەمانەن :

*****************

یەکەم/ نەزانی / واتە نەزانی بە ناسینی خوا (اللە) نەزانی بەدین ، نەزانی بەسەرەنجام و دوا ڕۆژی موسڵمان وای کردووە کە زۆر لاواز و تێشکاوین ، بێگومان نەزانیش چەندین دەر نجامی خراپی لێدەکەوێتەوە کە گرنگترینیان بریتین لە :

1- خۆشەویستی بۆ دنیاو ڕق بونەوە لە مردن وەک لە فەرموودەی پێغەمبەردا هاتووە (صلى الله عليه وسلم) .

2- فەوتانی نوێژەکان و شوێن کەوتنی ئارەزوەکان .

3- خۆ ئامادە نەکردن بۆ دوژمن و ڕووبەڕو بو نەوەی .

4- پەرتەوازەی جیاوازی .
5- نەبونی یەکیەتی و هاریکاری لە نێوان خۆیاندا .
***************

**دووەم/ ڕوخانی خیلافەتی ئیسلامی /**
بێگومان دوژمنانی موسڵمانان درکیان بەوە کردبوو کە هەتاکو موسڵمانان سەرکردەو ئەمیریان هەبێ ناتوانن بەسەریان دا زاڵ بن بۆیە کاتێک دەگەڕێنەوە بۆ مێژوو دەزانین چەندە هەوڵیاندا هەتاکو توانییان خیلافەت بڕوخێنن و بەهەستی زاڵ بوونی ئەوان زیادی کردوو لاوازی موسڵمانان یش زیاتر بوو .
*****************

**سێهەم / جیاکردنەوەی دین لە دەوڵەت /**
بێگوومان کاتێک موسڵمانان فەرمان رەوای خوا بۆ مرۆڤیان گۆڕی بەفەرمان رەوای مرۆڤ بۆ مرۆڤ وە بە دروشمی ( **دع مالقیصر لقیصر وما لله لله** ) یان لە واقعی ژیانی خۆیا جێ بە جێ کردو فەرمایشتەکان (أَفَغَيْرَ دِينِ اللَّهِ يَبْغُونَ) (وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللّهُ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ)(**المائده/44**)
یان فەرامۆش کرد توشی دابڕین و شڵەژاوی و لاوازی بوون .
******************

**چوارەم / ڕوخانی دەرونی بەرانبەر دوژمنان.**
شەکیب ئەرسەلان وتویەتی گەورەترین هۆکاری بەش بەش بونی موسڵمانان لەم چاخەی دوایدا بریتیە لە لەدەسدانی تەواوی متمانە بەخۆیان کە لەدەست دانی متمانە لە گەورەترینی نەخۆشیە کۆمەڵایەتیەکانە خراپترینی بەڵادەرونیەکانە کەزاڵ بوو بەسەر هەر ئومەتێک دا ئیلا پاڵی پێوە دەنێت بەرەو فەوتان و لە ناو چوون .
پرسیار کرا لە (علی کوری أبو طالب) (خوای لێرازی بێت) پێی گوترا ئەی پێشەوای بڕواداران تۆ کاتێک هێرش دەبەیتە سەر دوژمنەکەت (ألله أکبر)ێکی وا دەکەیت کە دڵەکانی پێ دادە ماڵرێن و دێنە خوارەوە فەرمووی : من ئەوە دەکەم چونکە بەرەو ڕوی دوژمنانم دەچمە پێشوو من

دڵنیام کە دەی کوژم وە ئەویش متمانەی تەواوی هەیە کە من دەی کوژم کەواتە من و خۆیشی بەسەر ئەودا زاڵین .
بەڵام ئەمرۆ موسلمان ئەو عەزیمەت و ورە بەرزەیان نەماوە .
****************

**پێنجەم / سەرسام بوون بە رۆژ ئاواو کردنی بە پێشەنگی چاک :**
بێگومان وای لێهاتووە لە وردو ڕشتی ژیانی موسڵمانان چاو لە رۆژ ئاوا دەکەن  تەنانەت لە رۆیشتن و پۆشینی جل تا بچوکترین شتانێکی وەک داهێنانی شێوەی قژو ....هتد . چەندین گەنج پێبڕ کێیان کردووە لەسەر ئەوەی کامیان دەتوانن لاسایی سەمای مایکڵ جاکسۆن  بکەنەوە ، یان لە گەنجێک پرسیار دەکرێت پێشەنگی هەرە بەرزی تۆ کێیە  لە جیاتی ئەوەی بڵێ ( پێغەمبەرەکەم ) وتویەتی مارادۆنا وە ئەمانەو چەندین نموونەی تر .
***************

**شەشەم/ خراپە کاری بە ناوی چاک سازی (الاصلاح )**
(وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ لَا تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ قَالُوا إِنَّمَا نَحْنُ مُصْلِحُونَ () أَلَا إِنَّهُمْ هُمُ الْمُفْسِدُونَ وَلَكِنْ لَا يَشْعُرُونَ) (البقرة/ 11 – 12) بەڵێ بە گۆشکردنی گەنجان بەدەرچون لە فەرمانی دایک و باوک و هەوڵدان بۆ ئەوەی خەڵک لە چوار چێوە کلتوریەکان جێبهێلن و تێکیان بشکێنن و بانگەشەی تاکە گەری و حیساب نەکردن بۆ دین و رەوشت و .....هتد . لەو دروشمە پرلە خراپە کاریانەن کە بەناوی چاک سازی و بەرەو پێش چون و دروست کردنی کۆمەڵگایەکی مەدەنی پەخش دەکرێت .
**************

**حەوتەم/ کۆکبونی دوژمنان لە دژی ئێمە /**
دوژمنانی ئەم ئوممەتە گەرچی دڵەکانیشیان دژی یەکتربێت و دوژمنی سەرسەختی یەکتریش بن ئەوا لە بەرامبەر ئێمەدا یەکن (تَحْسَبُهُمْ جَمِيعًا وَقُلُوبُهُمْ شَتَّى) بەڵام ئێمەی موسڵمان لەهەموو شتێکدا جیاوازیمان هەیە جگە لە خۆشەویستی و دۆستایەتی بۆ رۆژئاوا .

**هەشتەم/ کاریگەری ڕۆژ هەڵات ناسەکان و گومانەکانیان /**
**بێگومان هەمو ئەوەی رۆژهەڵات ناسەکان لەسەر ئیسلام و پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم ) و قورئان نوسیویانە چەندین نوسەرو بە ناو رۆ شن بیریش لە ناو موسڵمانان دا وەری دەگێرنە سەر ڕۆژنامەکان و لاوانی ئەو ئوممەتەی پێ توشی دڕدۆنگی و دوو دڵی دەکەن لە بەرامبەر بیرو باوەرەکەیان سەرئەنجامیش رۆشنای ئیمان و باوەڕێکی پتەو لە دڵی گەنجەکاندا دەداتە کزی و لاوازی ئە ویش ڕەنگدانەوەی راستەو خۆی دەبێت بەسەر تەواوی موسلمانان .**
******************

**نۆیەم/ نەمانی کاریگەری مزگەوت /**
**لە زۆربەی وڵاتانی ئیسلامی مزگەوت تەنها بۆ جێ بەجێ کردنی پێنج نوێژە فەرزەکان بەکار دە هێنرێت وەلە هەندێ لە مزگەوتەکان کاتێک کەسێک دوادەکەوێت لەنوێژ بانگدەر پێی دەڵێت خواپاداشتت بداتەوە نوێژەکەت لەماڵەوە بکە چونکە مزگەوت دادەخەین بۆیە مزگەوت دابڕاوە لە کارە گرنگەکەی خۆی لەکاتێکدا مزگەوت لەسەردەمی پێغەمبەر( صلى الله عليه وسلم) مەڵبەندی سەرکردایەتی کردنی ئوممەت و پلان و زانست و زانیاری بوو بە نەمانی ڕۆڵی ڕاستەقینەی مزگەوت هۆکارێکی تری ئەو لاوازییەیە .**
********************

**دەیەم / کەمی زانایانی ڕاستەقینەی تەواو /**
**بێگومان لە وڵاتی ئیسلامی هەزاران نامەی ماجستێرو تێزی دکتۆرا دەبەین لەپسپۆرییە شەرعییەکان ، بەڵام کاتێک لە زانایانی کە بە کردەوە زانستەکەیان بسەلمێنن و دین ڕاگەیەنن بکۆلێتەوە ئەوا زۆر کەمن .**
*******************

**یازدەهەم/ خراپی پلانی فێرکردن لە قۆناغەکانی خوێندن لە وڵاتانی ئیسلامی/**

بێگومان پلانەکانی فێرکردن لە زۆرێک لە وڵاتانی ئیسلامی زۆر خراپە کە پلانەکانمان عەلمانیەت و چەپرەوی یان بیری تری هاوردەکراون لە رۆژهەڵات و رۆژئاوا.

*****************

**دوازدەهەم/نەبوونی خواستی و خەمی ئوممەت /**

بۆیە دەبینی زانایەک دەست دەکات بە دەرسێک لە دەرسە زانستییەکان سەرەتا خێرخوازی زۆرین بەڵام دوای بەرە بەرە کەم دەکاتەوە تاکو کەمێک نەبێ نامێنن بۆ فێربون هۆکاری ئەو دیار دەیەش ئەوەیە ئێمەی موسڵمان ئەمڕۆ لایەنی سۆزو عاتیفە زاڵترە لە لای ئارامگرتن و فێر بون و پێشکەوتن .

*****************

**سیازدەهەم/ زۆری هۆکارەکانی خۆش گوزەرانی و سەرقاڵی /**

هەروەها هەندێ هۆکاری ترکە دەبنە هۆی سەرقاڵی و تەمبەڵی و پاڵ دانەوەو واز هێنان لە کارو بارە گەورەکان و ئامانجە بەرزەکان .

***************

**چواردەهەم/ پسپۆری لە بابەتە بەشەکیەکان (الجزئی) کە زانستە شەرعیەکانی لاواز کردوە /**

بێگومان جیهان پێشتر جیهانی هونەرە شەرعیەکان بوو لە تەفسیرو فەرمودەو عەقیدەو ئوسوڵی فیقهی بەڵام ئەمرۆ فیقهی بۆ نمونە بووە بە دوو بەش جا لێرە چەندین پسپۆڕمان هەیە لە بواری (فیقهە ) وە ئەوانی تر لە بواری (اصول فقه) بەم شێوە زانستە شەرعییەکان دابەش بوون ،بۆیە کاتێک پرسیارێک روبەرووی کەسێک دەکرێتەوە کە لە بوارەکەی خۆی نیە وە ڵامی پێ نییە بەڵام لە ڕابردودا بەم شێوەیە نەبوە بۆ نمونە (طبری) کەلە تەفسیردا لێی دەڕوانیت کە لە زانستی تەفسیر لە لوتکەدایە لە فەرموودەدا لە بەرزی دایە لە زمانەوانیدا دەستە واژەکان بە هێزن هەروەها کەسایەتییەکی وەک( ابن تیمیە) نوسینەکانی هەندێکی لە بواری تەفسیردان ،هەندێ لە بواری فەرمودەدا هەندێ لە

**بواری عەقیدەدان هەندێ لە بواری( فقە) هەروەها  بوارەکانی( داد وەری و بانگەوازو مێژوو و سیاسەتی شەرعی).........هتد  جابروانەو بەراورد بکە لە نێوان زانستی ئەوان و زانسستی ئەمان .**

****************

**پانزەهەم/ داڕوخانی دەرونی لە بەرامەر هەندێک زانستی مادی و وە بەسوک سەیر کردنی پسپۆڕییە شەرعییەکان /**

**بۆ نمونە هەندێ گەنج لە کۆڕێکدا کۆدەبنەوەو پرسیار لە یەکتری دەکەن لە کوێ دەخوێنیت زۆر بە شانازی دەڵێ لە کۆلێجی پزیشکی ،ئەویش دەڵێ لە کۆلێجی ئەندازیاری دەخوێنم بەڵام ئەویش سەری خۆی دادەنوێنێ و دەڵێ نمرەکانم زۆر لاواز بو لە کۆلێجی شەریعە دەخوێنم! یان پرسیار دەکرێ لە کوێ خۆێندوتە یەکێک بە شانازی دەڵێ لە ئەمریکا بەڵام ئەوی تر دەڵێت باوکم ڕێی نەدا لە دەرەوە بخوێنم و لە وڵاتی خۆم دەخوێنم ئەمە بەشەرمەوە دەڵێ هەموو ئەمانە هۆکاری لاوازی و داڕوخانی دەرونی و یەکترین.**

**والسلام عليكم ورحمة الله وبركاته**

---

## چوارەم: بەڕێز مامۆستا مەلا علی ئاوەژە پێش نوێژی مزگەوتی ئیمامی عثمان و ووتار خوێن لەمزگەوتی بیلالی حەبەشی لە قەڵادزێ



بسم اللهالرحمن الرحيم

الحمد لله رب العالمين و الصلاة والسلام على رسول الأمين سيدنا وحبيبنا محمد(صلى اللهعليهوسلم) وعلى الهوأصحابه الطيبين الطاهرين ومن تبعهم بإ حسان إلى يوم الدين.

ئاینی پیرۆزی ئیسلام بەرنامەی ژیانەو خوای گەورە بۆ ئەوەی ناردوە هەتا ببێتە بناغەو بنچینەو بنەمای رەفتارو رەووشت و نەریتی کۆمەڵایەتی و سیستەمی سیاسی و هەتا هەموو چین و توێژوو لایەنەکانی ژیانی کۆمەڵگاکەی لەسەر بنیات بنرێ بەڵام بەداخەوە خەڵکانی ئێمە وا تێگەیشتون کەبەرزترین پلەی ئیسلامەتی ئەوەیە کەلەکونجی مزگەوتێک بئاخنێ و خەڵوە بکێشێ جەزبە بگرێ و خەریکی زکرو فکر: بی : بابیرو هۆشیشت بەشتی ترەوە خەریک بێ خەڵکی واتێدەگەن کە گۆرینی کۆمەڵگاوو بەر هەڵستی کردنی خراپەکاری و جیهادوو تێکۆشان کردن وەک جاران شتێکی سەرەکی ئیسلام نەماوون .
لە ڕاستیدا فکرو بیرو هۆش و دیدەو بۆچون زۆر گۆراوە تەم و مژێکی زۆر چڕوو پڕی بێ دینان ڕێگەی لە بینینمان گرتووە بۆیە ئێمەی موسڵمان لە کوردستان دا تین و تەوژمێکی وامان نییە کە ووزەو ورەمان

بخاته گەڕ چوونکه هەموو سست و مستین دەردی هەره سەختمان بێ دەنگی داعی و زانا کانمانه چوونکه ماوەیەکی زۆر دوورو درێژه داعی و زانای وامان تێدا هەڵنه کەوتووه و بڕواداران له دەوری کۆ ببنەوه وه به هەموو هێزی بیرو باوەر پەردەی ناحەق بدرێنن و حەق وەدەرخەن بۆ هەموو کۆمەڵانی خەڵکی پاک و داماو و بێ ئاگا روون بکەنەوه هەموو وێکڕا ووشیار ببنەوەو تەخت و بەختی زۆرداری و بێ دینی و نا عەدالەتی له بەین بەرن جالەبەر نەبوونی زانایەکی واو بێ ئاگایی موسڵمانان بەرانبەر زاڵم و تاغوتەکان که وەک زەروو خوێنی خەڵک دەمژن سەرهەڵدان و پەیدا بوونی زاراوەی نامۆی، یا که له سەرەتای ئاینی پیرۆزی ئیسلامیدا نەبوون وه ئەو واقیعه پڕستەمه دروست بووه هەرهەموو سەرئەنجامی ئەم هۆیانه یه که ئیشارەیان پێ دەکەین :

که دەستەڵاته زۆر دارەکان له کۆن و تازەدا جەماوەر خەڵک وەک گاگەل بەرەو هێنانەدی ئاواتی پیس و چەپەڵی خۆیان و ئاغاکانیان خستۆته پێش خواوه وه زیاد لەوەش میللەتی ئێمه له هەموو لایەکەوه هێرشی هەمه لایەنەی لەسەر بووه وه هەڕەشەی نەمانی لێکراوه خەتەریاتی لەسەر بووه لەهەموو رووانگەکانی ژیانەوه وه موسڵمانانی ولاتی ئێمەش لەکاتی پەیدا بوونی ئەم زوڵم و ستەمەدا ئەم فرسەتەیان لەدەست داوه بۆیه ئەورۆ دەبینین جێگەیان گیراوەو خەڵکانی علمانی پێشی پێ گرتوون جێگەی لێ گرتوون !

ئاینی پیرۆزی ئیسلام پێویستی بەکۆمەڵگایەک هەیه که بنمیچەو بنەمای لەسەر واقعێتی ئەو ئەحکامه شەرعییانه بێ کەویستی خوای گەورەن و لەژیانی رۆژانەی کۆمەڵگای موسڵمان دیاری کراون و ئەوکۆمەڵگایه تاکو کۆمەڵی خۆیان بۆ خوای گەوره یەک لا کردبێتەوه و خۆیان تەسلیمی خوای خۆیان کردبێ وه مردنیان پێ خۆشتر بێ لەژیان ئەو جۆره کۆمەڵگا کەمن و بەنادر دەست دەکەون هۆی لاوازبوونی موسڵمانان له کوردستان دا ئەوخالانەن کەئاماژەمان پێ کردوون .

1– بێ دەنگی داعی و زاناکانمان بەجۆرێکی وا حەق بەتەواوی دەرناخرێ و روونی ناکەنەوە .

2– نەبوونی مەرجەعێکی دینی کە شایستەو شایان بێ و بتوانێ هەموو خەڵکانی کوردستان یەک خا لەسەر بنەما شەرعیەکان لەسەر ویستی خوای گەورە.

3– کاتێک زوڵم و ستەم لەمیلەتەکەمان کراوە موسڵمانان بەئەرکی سەر شانی خۆیان هەڵنەستاون کەمیلەتەکە رێک و پێک خەن لەسەر بنەما شەرعیەکان بۆ ئەوماف و حەقەی کەهەیانە لەخاک و وڵات دا وەلەخەوی بێ ئاگای دا بوون کە ئەوخاڵە فەراغێکی زۆری داوە بۆ بێ هێزبوونی موسڵمانانی ئەو عەسرو زەمانە.

4– خەڵکانی عەلمانی ئەوفەراغەیان بەفرسەت زانی هاتن شوێنەکەیان گرت و بەناوی مەزڵومێتی خەڵکی کوردستان توانیان سەرکەوتن بەدەست بێنن ئەوان دەیان گوت (الحمدلله)ئینجا موسڵمانان دەیان گووت (بسم الله)

5– تەفرەقەو پارچە پارچە بوونی موسڵمانان یەک بەناوی صۆفی گەرێتییەوە یەک بەناوی سەلەفیەتەوە و یەک بەناوی یەکگرتوەو یەک بەناوی کۆمەڵەوە و یەک بەناوی بزووتنەوەو... هتد ئەوەش هۆیەکی دیکەیە بۆ لاواز بوونی موسڵمانانی کوردستان کەکاریگەرێکی تەواوی هەبوە لەسەر دڵ ساردبونەوەی موسڵمانان.

6– سیاسەت کردنی ئەو لایەنە ئیسلامیانە لەگەڵ یەکتردا وە ناعەدالەتی لەناوو خۆیان دا و تێکەڵاوی لەگەڵ غەیری خۆیان بەو هۆیانەوە عقیدەو بیرو باوە ڕی موسڵمان لاوازتر دەکات.

7– شەڕی ناو خۆ کەزەرەروو زیانێکی زۆری هەبوو بۆ هەموولایەک.

8– تەبلیغاتی دژی چەکداری لەلایەن هەندێک موسڵمانانەوە.

9– هەڵبژاردنەکان و توانای دەستەڵاتی لایەنی بەهێز.

10– هاتنی ئەمریکا بوو بەهۆی بەهێزبونی لایەنی علمانی.

**11- دونیا ویستی و خۆشەویستی خەیاڵاتی جۆراو جۆری شەیتان.**

**داوا دەکەم لەخوای گەورە کەمەرجەعێکی دینی سەرتا سەریمان بۆ بنێرێ لە میللەتی خۆمان لە وڵاتی خۆمان دا بۆ ئەوەی بەختەوەری دین و دونیا بین و خوای گەورە ئەو نازوو نیعمەتەی پێ بەخشیوین بۆمان زیادوو باشتر بکات و هەموو لایەکمان سەربەرزی دنیاوو قیامەت بکات. (اللـهم ئامین)**

**والسلام علیکم ورحمة الله وبرکاته**

---

## پێنجەم: بەڕێز مامۆستا محمد سینەمۆکی بەرپرسی مەڵبەندی پێنجی کۆمەڵی ئیسلامی



بسم الله الحمدلله الصلاة والسلام على رسول الله محمد اعلى اله وصحبه ومن والاه:

شتێکی بەڵگە نەویستەو جێگای وەبیر هێنانەوەیە کەموسڵمانان روخێنرانی دەسەڵاتی ئیسلامی لەساڵی 1920زاینی یەوە موسڵمانان وەک و (ئاردی ناو درویان لێهات) بەڵام الحمدلله دواتر وردە وردە زانایان و بانگ خوازان و خەم خۆرانی ئیسلام لێرەو لەوێ دەستیان کردەوە بەبزواندنی دڵەزیندوەکان و بەخەبەر هێنانەوەی دڵەخەوتوەکان و هۆشیار کردنەوەو ساریژ کردنەوەی دڵە نەخۆشەکان بۆیە دەبینی ئەمرۆ الحمدلله ئیسلام و موسڵمانان بونەتە بنێشتە خۆشەی سەر لێوان ولەمیدیای رۆژ هەڵات و رۆژ ئاوا و بەڵکو لەسەرتاپای وڵاتانی دنیا قسەوباسی لێوە دەکرێ و بەهەموو توانای زل هێزەکانەوە دژایەتی دەکرێ بەڵام لەگەڵ ئەوەش دا دەبینین ئەمرۆ تاکە ئاینێک کەئومێدی پیروو هیوای گەنج بێت تەنها ئیسلامە وەدینێک دەردی دەرونی پیاو ئافرەت چارەسەر بکات هەر ئیسلامە. بەڵام ئەوەی جێگەی داخە کە ئێمەی پەیڕەوانی ئیسلام لەئاستی دینەکەمان دا نین دینەکەمان زۆر بەهێزە بەڵام ( متدین ) زۆر لاوازە دیارە ئەگەر ئێمە لەئاستی ئیسلام دا باین بێ گومان ئێستا ئیسلام لەقۆناغێکی دیکەدا یەو کەمن زۆر زۆر

دڵخۆشم بەئایندەی ئیسلام و موسڵمانان بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا من پێم وایە لەزۆر بواردا لاوازن و پێویست دەکات بەر لەوەی لۆمەی بێ بڕوایان و دەسەڵات دارانی زل هێز یان جەماوەر بکەین لۆمەی خۆمان بکەین کە ئێمە وەک و پەیڕەوانی ئیسلام نەمان توانیوە روی ئیسلام وەک و خۆی نیشانی خەڵک بدەین و بەڵکو نەمان توانیوە هەموو هۆکارێکی پێویست بگرینەبەر بۆ ئاشنا بونەوەی خەڵکی موسڵمان لەئیسلام و دینەکەیان و تەنانەت نازانین بەچ شێوەو پرۆژەیەک بە ژدار دەبین لەشایی و شینی میللەتەکەمان چ جای لەکایەی سیاسی و ئابوری و فەرهەنگی و .... هتد

من بەکورتی هۆکارەکانی لاوازی دەگەرێنمەوە بۆ ئەم خاڵانەی خوارەوە

1- لاوازی پابەند بونی بەئاکاروو شیعارەکانی ئیسلامەوە نەبرایان نەخوشکان کەم ترین رەنگ دانەوەیان پێوەدیارە .

2- نەبوونی برایەتی تۆکمە لەنێوان زانایان و بانگ خوازان دا بەڵکوو بەداخەوە هەندێ لە موسڵمانان دەبینی کەلە لوتکەی بێ دەسەڵاتی دان کەچی بانگەشەی دەنگ دابڕین(هیجر)دەکەن لەو موسڵمانانەی کەدیدو بۆچونیان یان بیرکردنەوەیان وەک و ئەوان نیە !!!!

3- لاوازی هەندێ لەووتار بێژەکانمان لەڕوی هونەری و ووتاردانی ئامانج داروو نەبونی پلان لەوروژاندنی هەر بابەتێک دا.

4- بێ ئاگایی زۆرێک لەزانایان و بانگ خوازان لەزانستەکانی رۆژگارو بێ بەش کردنیان لەپسپۆری بونیان دا لەوزانستانە .

5- لاوازی ئەزموونی سیاسی ئیداری لای زۆربەی بانگ خوازوو کە ئەم لاوازییە زۆر جاران بێ ئومێدییەک لای جەماوەر دروست دەکات کە کەسێک نەتوانێ ئیدارەیەکی سەرکەوتوی مزگەوتێک قوتابخانەیەک ململانێیەک بکات چۆن دەتوانێ ئیدارەی حوکمەتێک بکات!!!.

6- نەبوونی پلان لەلای زۆرێک لە زانایان و بانگخوازان و سەرکردایەتی ڕەوتە ئیسلامیەکان بۆ ئایندە!!.

خاوەن کۆمپانیایەک بەرنامە دادەنێ کە کارو چالاکیەکانی کۆمپانیاکەی

**زۆربەی شارو شارۆچکەکان بگرێتەوە بەڵکو لەهەموو بوارەکاندا بەرهەمی هەبێت کەچی بەداخەوە ئەمرۆ کە ئەزمەو قەیرانی بانگخواز و کادیرو وتار بێژو فقیهی ....هتد هەیە کەچی کوا پلان؟؟!!.**
**7- نەبونی یەکڕیزی و یەک هەڵوێستی لە نێو موسڵمانان دا و بونی پەرتەوازەی و گواستنەوەی کێشە و گرفت و ناکۆکیەکانی وڵاتانی دی بۆ گۆرەپانی کوردستان کە دەرئەنجامەکەی یەکسانە بە لاوازی قسەو گفتارمان لای خەڵکی و جەماوەر .**
**8- لاواز بوون بەڵکو خەریکە بڵێم نەمانی خەمی ئیسلام و بانگەوازی ئیسلامی لای زۆربەمان و لەو لاوە زۆر بونی و کەڵەکە بونی چەندانی خەمی لاوەکی دیکە کە ئەرکی سەرشانمان وەلا ناوەو سەرقاڵی کاری لاوەکین بەیەکەوە سەرقالین .**

**والسلام عليكم ورحمة الله وبركاته**

---

## شەشەم: بەڕێز مامۆستا حسن کانی تووی‌ی حافز قورئان و موفەسیری قورئان



بسم اللهالرحمن الرحيم

الحمد لله رب العالمين و الصلاة والسلام على رسول الأمين سيدنا وحبيبنا محمد(صلى اللهعليهوسلم) وعلى الهوأصحابه الطيبين الطاهرين ومن تبعهم بإ حسان إلى يوم الدين.

### (بۆچی ئیسلامی یەکان ڕۆژ بۆڕۆژی بەرەو کزەڵۆکی و لێک دورکەوتنەوە دەچن)؟!

(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِذَا لَقِيتُمْ فِئَةً فَاثْبُتُواْ وَاذْكُرُواْ اللَّهَ كَثِيرًا لَّعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ()وَأَطِيعُواْ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَلاَ تَنَازَعُواْ فَتَفْشَلُواْ وَتَذْهَبَ رِيحُكُمْ وَاصْبِرُواْ إِنَّ اللَّهَ مَعَ الصَّابِرِينَ) **(الأنفال/45 – 46)**

**ئەی بڕواداران هەرکات توشی دەستەیەک بون کەدەیان هەویست بجەنگن لەگەڵتان خۆ ڕابگرن لەبەرامبەریان دا وە زۆر یادی خوا بکەن حەتمەن سەردەکەون،وە گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرەکەی بن و کێشەو دووبەرەکی مەکەن دەسا فەشەل دێنن و ڕۆژ بۆ ڕۆژی بەرەو کزەلۆکی دەڕۆن و سام و هەیبەت و دەڕوات.(خۆئەگەر هەڵەو کەم و کوڕییە کیش هەبوو لە ناو خۆتان دا چاوپۆشی لیبکەن) و ئارامی خۆتان بپارێزن، چونکە بەڕاستی خوا لە گەڵ خۆ پارێزانە...**

**بەلای منەوە دواکەوتن و لاوازی و کزەڵۆکی موسڵمانان هۆکاری یەکجار زۆری هەیە: لەوانە:**

**یەکەم: تەفسیرکردنەوەی نەسەکانی ئیسلام بەهەردوو بەشی قورئان و سونەت. دیارە نەک هەرئەوانەی خۆیان ناوناوە ئەحزابی ئیسلامی بەڵکو هەرکەسە لەناو موسڵمانان داو دەیهەوێ خۆی دەرخاو بیرۆکەیەکی هەیەو دەیهەوێ بیرۆکەکەی خۆی بسەپێنێ ڕاستەوخۆ نەسەکان لەسەرویست و ئارەزوی خۆی تەفسیر دەکاتەوە. جا کەیفی خۆیەتی واقعەن ئەو نەسانە ئەو تەفسیرە هەڵدەگرێ یان نا مەسەلەیەک نی یە.**

**دووەم: گوێ ڕانەگرتن بۆ یەکتری و لێک حاڵی نەبوون، وە یەکتر قبوڵ نەکردن. ئەوە بەڕاستی هۆیەکی یەکجار سەرەکی و کاریگەرە بۆئەو حاڵەتەی ئەمڕۆ بەسەر ئیسلامی یەکان و موسڵمانان دا هاتووە، هەرکەس دوو سێ ئایەت یان دوو سێ فەرموودەی خوێندنەوە یەکسەر خۆی لە لا دەبێتە عەللامەو قسەی کەسی قبوڵ نی یەو زۆرجاریش وە زۆرکەسیش کە هاتووە بۆ لام و کێشەی لەگەڵ کردووم لەوانە. ووتویەتی ئێمە نەشەرع و نەشەرح و نە تەفسیرمان قبوڵ نی یەو خۆمان واتا لە ئایەت و فەرموودەکان دەدەینەوە فەرقی ئێمەو ئیمامی شافیعی چی یە. بەڵام ئەگەر بەسیت ترین ئایەت یان فەرموودەم لێبپرسیتەوە دەستە وەستان بوون.:** (وَقَدْ كَانَ فَرِيقٌ مِنْهُمْ يَسْمَعُونَ كَلَامَ اللَّهِ ثُمَّ يُحَرِّفُونَهُ مِنْ بَعْدِ مَا عَقَلُوهُ وَهُمْ يَعْلَمُونَ...)**(سورة البقرة/75) بەڕاستی دەستەیەک لەوانە گوێ رادەگرن بۆ فەرموودەکانی خوا دوایە لەسەر خواستی خۆیان لەواتا سەرەکی یەکەی خۆی لای دەدەن دوای ئەوەی لێی حاڵی بوون لەکاتێکدا خۆشییان دەزانن.**

(وَإِذَا جَاءَهُمْ أَمْرٌ مِّنَ الأَمْنِ أَوِ الْخَوْفِ أَذَاعُواْ بِهِ وَلَوْ رَدُّوهُ إِلَى الرَّسُولِ وَإِلَى أُولِي الأَمْرِ مِنْهُمْ لَعَلِمَهُ الَّذِينَ يَسْتَنبِطُونَهُ مِنْهُمْ وَلَوْلاَ فَضْلُ اللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُ لاَتَّبَعْتُمُ الشَّيْطَانَ إِلاَّ قَلِيلاً) **(سورة النساء/83) هەرکات فەرمانێک هات جا چی دەربارەی ئاسایشێ یان ترس و بیم یەکسەر بڵاوی دەکەنەوە،ئەگەر ئەوانە لە خۆوەو بەپێی تێگەیشتنی خۆیان بڵاوی ئەکەنەوە بەڵکو بیگێڕنەوە بۆ لای پێغەمبەرو کاربەدەست و پێشەواکانییان لەخۆیان ئەوان باشتر دەزانن چۆن یاساو**

**ئەحكامێكی لێ وەربگرن لەوان خۆ ئەگەر بەخشش و میهرەبانی خوا نەبویایە بەدەستانەوە هەرهەمووتان پەیڕەویتان لەشەیتان دەكرد جگە لە كەمێكمان.**

**سێهەم:(جێ تە لٓە بی لە لایەن سەركردەكانی گشت ئەو حیزبە ئیسلامیانە ) ئەگەر ئاوڕێك بەرەولای مێژووی ئیسلام بدەینەوە دەبینین گەورەو سەركردەكانی موسڵمانان نەک هەرهەوڵیان نەداوە بۆ پلەوپایەو سەرۆكایەتی بەڵكو زۆرجارو زۆركەسییان هەڵپەی كردووە كە كرابێت بەسەركردەو پێشەوا بەڵكو ڕاستەو داوایان كردووە كە ئەو بەرپرسیاریەتەیان پێ ئەسپێردرێ. نەوەک نەتوانن وەكو خۆی بەڕێوە بەرن... بەڵام بەداخەوە بەرپرسەكانی حیزبە ئیسلامی یەكان نەک هەرداوای دەكەن بەڵكو شەڕیشی لەسەردەكەن، هەتا بۆ گەیشتن بەو پلەو پایە دەربەست نی یە داخۆ قازانجی ئیسلام و موسڵمانانی تێدایە؟ یان زەرەر؟ بەس گرنگ ئەوەیە دەستی ئەوی(دەستێك گوشت بە من ببڕێ و قەصاب گۆر بە گۆڕ چێ) هەموومان دەزانین لەو پێناوەدا موسڵمان جیاوازیان كەوتۆتە ناو بونە چەندین دەستە:** (قَالُوا نَحْنُ أُولُو قُوَّةٍ وَأُولُو بَأْسٍ شَدِيدٍ وَالْأَمْرُ إِلَيْكِ فَانْظُرِي مَاذَا تَأْمُرِينَ) **(سورة النمل/33) هیچ تاوان نی یە كەخوای گەورە ئاگادارە بە هەرچی دەیشارنەوە لە دڵی خۆیان دا داخۆ ئیشییان چی یە ئەوكەسانەو و ئەوەش ڕای دەگەیەنن بۆ خەڵک و خەڵكی پێ چەواشە دەكەن، بەڕاستی ئەو ئەوانەی خۆشناون خۆیان دەكەنە بەگەورە بەسەر خەڵكەوە. داوای ئەوەدەكەن:(** إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ **).. بەس ئەوەش قەینا كە ئەگەر مەبەست خزمەت كردن بێ و پێش بردنی كاری موسڵمانان بێ هەرچاكە. بەڵام بەداخەوە تەنها مەبەستەكە خواش دەزانێ – ناو و ناوبانگ و ماڵی دونیایە.. ئەوە تاوەكو بە چاوی خۆمان دەبینین هەموو سەرۆک حیزبە ئیسلامی یەكان یان وەزیرن یان ئەندام پەرلەمانن یان هەبوون ئەوەش هەمووی بۆ پلەو پایەو ئەوپارە لێشاوەی كە دەیان درێتێ لەلایەن حوكمەتی عێراق، یان**

**کوردستانەوە!!!:**( مَّن كَانَ يُرِيدُ ٱلعَاجِلَةَ عَجَّلنَا لَهُۥ فِيهَا مَا نَشَاءُ لِمَن نُّرِيدُ ثُمَّ جَعَلنَا لَهُۥ جَهَنَّمَ يَصلَىٰهَا مَذمُومًا مَّدحُورًا) **(الإسراء/١٨)**
**هەرکەس هەوڵی بەدەست هێنانی پاداشتی دونیایە بەکارەکانی و دەیهەوێ بەپەلە پاداشتەکەی دەست کەوێ ئێمە بەپەلە پاداشتی دەدەینەوە لە دونیادا ئەوەندەی حەزمان لێبێ و بەهەرکەس بمان هەوێ. دوایە دۆزەخمان بۆ داناوە دەچێتە ناوی بەو پەڕی لۆمە کراوی و ڕیسوای و دەرکراو لە رەحمەتی خوا:**
**لە لایەکی تریشەوە ئەگەر دەستیش کەوت بە گولەش لەدەستی دەرنایەتەوە ئەگەر سەدان کەسی لەسەر بەکوشت بدا . وەدەربەست نیە داخۆ دەتوانێت ئەوکارە بەرێوە بەرێ یان نا . گرنگ ئەوە ئەو سەرۆک بێت . کەدەبینین لەو پێناوەدا چەندین کوتلەی ئیسلامی بونە پارچە پارچەو گێچەڵوەر لە نێوانیان دا دروست بووە ...**
**چوارەم: نەبوونی تەقواو ترسان لەخوا هەم لەلایەن سەرکردەکان و هەم لە لایەن خەڵکە ئیسلامیەکانەوە . کە بەداخەوە هەرهەموویان دەمیان کراوەتەوە لە بەرامبەر یەکتری ، دوعات ئەوە بێت لەگەڵ کەسێکیان دانەنیشی . ئەوە هەتا غەیبەت و بوختان و درۆو دەلەسە هەڵبەستن راوەستابێ بەرامبەر یەکتری گوێت لە شتێکی تر نابێ . زۆر سەیرە دەڵێی ئەوانە باوەریان بەو ئایەت و فەرمودانە نیە کە دەربارەی غەیبەت و بوختان و درۆ و دەلەسە سازکردن هاتون**(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اجْتَنِبُوا كَثِيرًا مِنَ الظَّنِّ إِنَّ بَعْضَ الظَّنِّ إِثْمٌ وَلَا تَجَسَّسُوا وَلَا يَغْتَبْ بَعْضُكُمْ بَعْضًا أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَنْ يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ مَيْتًا فَكَرِهْتُمُوهُ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ تَوَّابٌ رَحِيمٌ) **(الحجرات/ 12) ئەی برواداران خۆتان زۆر بپارێزن لە گومان بردن جوونکە زۆر لەو گومانانە تاوانن . وە سیخوری مەکەن بەسەر یەکەوەو خۆبەخۆ غەیبەتی یەکتری مەکەن، مەگەر کەستان پێتان خۆشە گۆشتی برای خۆتان بخۆن بە مردوی ؟ دیارە نەخێر پێتان ناخۆشە** (وَالَّذِينَ يُؤْذُونَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ بِغَيْرِ مَا اكْتَسَبُوا فَقَدِ احْتَمَلُوا بُهْتَانًا وَإِثْمًا مُبِينًا)**(الاحزاب/ 58) بێ گوومان ئەوانەی ئازاری بروادارانی پیاو**

و ژن دەدەن بە تاوان بارکردن یان بە شتێک کە نەیان کردووە بەراستی بوختان تاوانێکی زۆر ئاشکرایان هەڵگرتووە

**پێنجەم: (1) نەبونی تەقوا لە لایەن سەرکردەوەو کەسە ئیسلامیەکانەوە . کە دیارە تەقوا کلیلێکی هەموو سەرکەوتن و بەختەوەرییەکە لە دونیاو دوا رۆژدا(...**مَن كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَمَن يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَل لَّهُ مَخْرَجًا ﴿٢﴾....وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُ إِنَّ اللَّهَ بَالِغُ أَمْرِهِ قَدْ جَعَلَ اللَّهُ لِكُلِّ شَيْءٍ قَدْرًا ﴿٣﴾)

**(الطلاق2–3) وەهەرکەس تەقوای خوای هەبێ ( واتا خۆ پارێزی و لە بێ فەرمانی خوا ) دەروی بەخێری لێ دەکاتەوەو رۆزی دەدات لە لایەکەوە کە هەرگیز چاوەروانی نەبێ:**

**(1)دیارە ئەو دووخاڵە لە یەک جیاوازن بەوە نیە عینوانەکەیان یەکەو وە دەشتوانن بەگوێرەی ناوە ڕۆکەکەیان عینوانیان بۆ دانێین .**

(وَمَن يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَل لَّهُ مِنْ أَمْرِهِ يُسْرًا)**(الطلاق /4) هەرکەس خۆی بپارێزێ لە بێ فەرمانیەکانی خوا خوای گەورە هەمو کارەکانی بۆ ئاسان دەکا..**(وَمَن يَتَّقِ اللَّهَ يُكَفِّرْ عَنْهُ سَيِّئَاتِهِ وَيُعْظِمْ لَهُ أَجْرًا) **(الطلاق/5) و هەرکەس شەرم لە خوا بکات تەواوی تاوانەکانی لێ پاک دەکاتەوەو پاداشتی گەورەشی دەداتەوە.**

**شەشەم : هەدەف و مەبەست خوا بێ دەبێ ئە وکارانەی کە برای موسڵمان و ئەحزابی ئیسلامی دەیکا هەمو مەبەستەکەی ئاینی خوا بێ و لەبەر خاتری خوابێ:** (فَآتِ ذَا الْقُرْبَى حَقَّهُ وَالْمِسْكِينَ وَابْنَ السَّبِيلِ ذَلِكَ خَيْرٌ لِّلَّذِينَ يُرِيدُونَ وَجْهَ اللَّهِ وَأُوْلَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ) **(الروم/38) ئەوە بۆ ئەو کەسانە خێرو چاکەیان کە بەکارەکانیان مەبەستیان رەزابوونی خوایەو بەس ئائەوانە بەختەوەر و سەرکەوتون . بەڵام بە داخەوە ئیسلام ئاین و هەدەف نیە بۆ زۆر لەو ئەحزابە ئیسلامیانە . بەڵکو ئیسلامیان کردۆتە وەسیلە بۆ گەیشتن بەو مەبەستە سیاسی و مادی و ئەوەی بۆ خۆیان دەیان هەوێ.. فەرموو گوێ بگرە ئەمە قسەی سکر تێری مەکتەبی سیاسی یەکێک لەو حزبە ئیسلامیانەیە: (ئێمە رۆژێک لە رۆژان نەمان گوتووە حیزبێکی**

**ئاینین! ،گوتوومانە : حزبێکی سیاسین و بەمەرجەعیەتی ئیسلامی کاردەکەین ، هەوڵیش نادەین ببینە کۆسپی هیچ لایەنێک ، دەمانەوێت سود لە ئەزموونە سیاسیەکانی حیزبەکانی ناوەوەو دەرەوە وەربگرین .. ڕاو ڕای جیاوازیش هەیە لە سەرکردایەتی و مەکتەبی سیاسی ..... لە بارەی ئیسلامی بون و نەبونی و شتێکی ئاساییە) نەم ویست ناوی بەرم ...**

**حەوتەم: بوونی ئەم هەموو ئەحزابە بەناوی ئیسلامەوە گەورەترین کاریگەری خراپی هەیە لەسەر پێشکەوتن و بەرەو پێش چونی موسڵمانان. کە دیارە هەرکات پارچە پارچە بون کێشە دروست دەبێت چونکە**(قُلْ هُوَ الْقَادِرُ عَلَى أَن يَبْعَثَ عَلَيْكُمْ عَذَابًا مِّن فَوْقِكُمْ أَوْ مِن تَحْتِ أَرْجُلِكُمْ أَوْ يَلْبِسَكُمْ شِيَعاً وَيُذِيقَ بَعْضَكُم بَأْسَ بَعْضٍ انظُرْ كَيْفَ نُصَرِّفُ الآيَاتِ لَعَلَّهُمْ يَفْقَهُونَ) **( الانعام/ 65) یان بەرگی پارچە پارچە بونیان لەبەر دەکەین و خۆ بەخۆ سزای یەکتری دەچێژن ، جا سەیرکەن چۆن ئایەتەکان رون دەکەینەوە بۆ ئەوەی لێیان تێبگەن... ئەمە لە کاتێکدایە کە خوای گەورە دەفەرموێ**(وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَأُوْلَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ) **(ال عمران/ 104) هەر لە خۆیان ئەی گەلی بڕواداران تاکە کۆمەڵێک پێک بێنن کە خەڵکی بەرەو خێرو چاکە بانگ بکەن و فەرمان بە چاکەو نەهی لە خراپە بکەن. جا ئائەوانە سەرکەوت و سەرفرازن ...**

**والسلام عليكم ورحمة الله وبركاته**

---

## حەوتەم: بەڕێز مامۆستا محمد قادر محمد مامۆستای ڕانیەی پیشەی ناسراو بەمامۆستا محمدی ڕەزگەی



بسم اللهالرحمن الرحيم

الحمد لله رب العالمين و الصلاة والسلام على رسول الأمين سيدنا وحبيبنا محمد(صلى اللهعليهوسلم) وعلى الهوأصحابه الطيبين الطاهرين ومن تبعهم بإ حسان إلى يوم الدين.

**(گرنگ ترین هۆکارەکانی کزبونی هزری ئیسلامی و دیاردەی خودا پەرستی راستەقینە لەسەر شەقامی کوردی)**

ئێمە وەکو خەڵکی کوردستان پێمان وایە کە ئەو بارو دۆخەی بەسەر کوردستان دا هاتووە و تێدەپەڕێت بە شێوازی جۆراو جۆار ، هەندێک چەسپاوەو لە چەند تاقیگەیەکی تایبەت و خۆ ڕژم دەکاتە ناو کوردستان زۆر بە وردی کاری بۆ دەکرێ هەموو ئەمانە هۆکاری سەرەکین بۆ لاسەنگ کردنی تەرازوی راستە قینەو گۆرینی داب و نەریتی رەسەنی ئەو خەڵکە دەتوانین هۆکارەکان کورت بکەینەوە لەم چەند خاڵەی خوارەوەدا :

1- هۆکاری دەرەکی ئەویش ئەکرێ بە دوو بەشەوە.

**(یەکەمیان)**: فشاری وڵاتانی دەوروبەر{{إقليمى}} بەمەبەستی پاوان کردن و پاوان خوازی و بەهرەمەند بوون لە خێرو بێری ناوچەکە .

**(دووەم)**: سەپاندنی ئایدۆلۆژیای ئەوروپی و رۆژئاوای بەمەبەستی ئاڵۆزکردنی فیکری ئیسلامی و هاوردە کردنی دیاردەی نامۆ بەهەست و نەستی دانیشتوانی ئەو ناوچە خێر لە خۆ نەدیوەو چاندنی تۆوی دڕک

دارو ناشەرعی لە ژێر پەردەی ئازادی و نویٚ خوازی و پێش کەوتن .
2- بیٚ ئاگایی و ناوەوەی زۆربەی دانیشتوانی کوردستان لە پیلان و نەخشە دارێژراوەکان چونکە پیلانەکە لە قاڵبی بەناو ئازادی و دیمۆکراسی و پێشکەوتن خوازی خراوەتە روو .
3- پیادەکردن و گەشەی فکرەی سەرمایە داری و بەندایەتی ماڵ و سامان و پێشبرکیٚ کردن بە مەبەستی وە دەست هێنانی سەروەت و سامان لە هەر ڕێگایەکەوە بێت شەرعی یان نا شەرعی کە زۆر بە داخەوە ئەوانەی خۆشیان بە پێشەنگ و پێشەوای موسڵمانان دەزانن کەوتونەتە ئەو داوەوە موتمانەیان لە دەست داوە .
4- سەرهەڵدانی دەیان و سەدان حیزب و گروپی بە ناوی ئازادی بیرو را کە زۆر بەیان دروست کراون و کار بۆ ئەنجام دانی بەرژەوەندییە تایبەتیەکان . بە پێچەوانەی وڵاتانی پێش کەوتو کە فرە حیزبی لە لای ئەوان بۆ بەرژەوەندی خەڵکییە بە گشتی .
5- ئەوانەی کە خۆیان بە پێشەنگ و (قدوە) ی موسڵمانان ناوز زەنگ کردبوو حەقیان لە خۆدا دەبینی، ناحەق لە خەڵکی داو خۆیان بە جێگری (پێغەمبەر) درودی خوای لەسەر بێت دەزانی هۆکارێکی سەرەکی بوون بۆ سەر هەڵدانی دڵە راوکیٚ و گومان بەرامبەر بەڕاستی ناسینی ئاینی پیرۆزی ئیسلام چونکە کردارەکانیان پێچەوانەی دروشم و گوفتارەکانیان دەرچوو بە تایبەت دوای بەدەست هێنانی هەندێک لە بەرژەوەندیە تایبەت یە کانیان کە ئەوانیش تێکەڵاوی دونیا خواردن و خۆشی گوزەرانی بوون .
6- دروست کردنی ئەخلاق و جیاوازی لە عیبادەت پەرستنە کاندا بیٚ ڕەچاو کردنی بنەما رەسەنەکانی ئیسلام لە مەقاصیوئەولەویات و عورف دا بۆ نموونە یەکیٚ ئەڵیٚ فاتیحا بخوێنەو ئەوی تر دەڵێت مەی خێنە ئەو دەڵیٚ دەست نێژ دەشکیٚ و ئەوی تر دەڵیٚ ناشکیٚ هەتا کۆتایی .
وەک و یەک گرفت نەبیٚ تەنها ئەو جوزئیاتانەی . بەڵام لەم دەلاقەوە زۆربەی ناحەزان ئامانجەکانیان پێکاوە .

7– دروست کردن و دانانی کەسانی نەزانی بێ ئەزمون و نەشیاو لە لایەن سوڵطە وە بۆ مەبەستی پێشەوایەتی کردن و پیادەکردنی ئاینی ئیسلام.

والسلام عليكم ورحمة الله وبركاته

---

## هەشتەم: بەڕێزمامۆستاعلاء الدين سليمان محمدپێش نوێژو ووتارخوێنی مزگەوتی گەیلانی لەسەنگەسەر



الحمد لله الصلاة والسلام على رسول الله وعلى أله و اصحابه ومن تبعه بإحسان إلى يوم الدين .

دوای سوپاس و ستایشی زۆر بۆزاتی خواو . ڕەواندنی ڕەحمەت و بەرەکەت بۆسەر گیانی پێغەمبەری پێشەوا(محمد المصطفى صلى الله عليه وسلم). (**خاڵە بەهێزو لاوازەکانی موسلمانانی کوردستان**)

ڕوون و ئاشکرایە کە هەموو مرۆڤێک و نەتەوەیەک خاوەنی بیرو بڕواو داب و نەریتێکی تایبەتە ، لە ژیان و هەڵس وکەوتی خۆیدا . هەندێک لەو داب و نەریتانە جێگەی شانازی ئەو نەتەوەیەن و بەو سیفات و ئەخلاقیاتانە میللەتی کورد بە گشتی . کە وەکو هەموو میللەتانی تر خاوەنی زۆر شتی گیرینگ و جوان و ڕێک و پێکە. میللەتی کورد بە میللەتێکی ئاین پەروەرو سەخی و بەغیرەت بە ناو بانگە ، لە هەمان کاتدا لەڕوی مافەوە زۆر چەوسێنراوە تەوەو مافی لێزەوت کراوەو تەنانەت لە زۆر شوێندا زمانی فەرمی خۆیشی لێ قەدەغە کراوە و بەزمانی دایک نەی توانیوە بنوسێ و گفتو گۆ بکات و خاوەنی

**دەستەڵاتی خۆی نەبوەو نەی توانیوە ناوماڵی خۆی وەک پێویست ڕێک بخات . لەگەڵ ئەو هەمو زوڵم و ستەمانەشی کە لێی کراوە . ئاینی ئیسلامی پیرۆزی وەک ئاینێکی فەرمی قوبوڵ بووەو لەسەروی هەموئاینەکانی تری داناوەو حیسابی بۆ کردووە . هەرچەندە گرفتێکی سەرەکی هەبوە کە نەیتوانی وە وەک پێویست بە شێوەیەکی (تعبدی) ئاینەکەی بەڕێوە بەرێ. بەهۆی کەم زانینی زمانی عەرەبی(اللغة العربیة) کە زمانی (قورئان و حدیث)ی (پێغەمبەرمان. محمد المصطفی صلی الله علیه وسلم) بەڵام هیچ کات ئامادە نەبوە . دژایەتی ئاینی ئیسلامی پیرۆز بکات بەمانا دژایەتی (خوا. پێغەمبەر. قورئان) بەڵکو پیرۆزترین شت لە لای ئێمە ئەوانە بوون . میللەتی کورد ئەوەندەی لە ژیانی خۆیدا هەوڵی داوە بۆ رزگار کردنی نیشتیمانی میللەتەکەی و بەدەست هێنانی مافەرەواکانی و سەرقاڵی شۆڕش و خەبات بون . نەی پەرژاوەتە سەر مەسئەلە ئاینی و کۆمەڵایەتیەکان . لەروی سیاسی و ئابوری و رۆشن بیری و بەهێزکردنی پەیوەندیەکانی ناو خۆو دەرەکی هتد. هەربۆیە زۆرجار تێک هەڵچونێک بووە لە نێوان بۆ چونە ئیسلامیەکان و نەتەوەییەکاندا بۆ بە دەست هێنانی مافەکانی میللەتەکەمان . و بوە بەهۆی لێک حاڵی نەبونی یەکتری و زۆر جاریش دوژمنانی کورد هەوڵیان داوە میللەتی کورد وا لێحاڵی بکەن و بڵێن ئیسلام ڕێگر بوە لە بەردەم بەدەست هێنانی مافەرەواکانی کورد . ئەوەش لە کارو کردەوەکانی شوێن کەوتوانی ئیسلامەوە توانییانە ئیسلام وەک بەرنامە ناشرین بکەن. هەربۆیەش لەو دواییانەدا ئەحزابی ئیسلامی پەیدا بون و ئەوانیش ویستیان بڵێن وانییەو ئیسلام بۆ ئەوە هاتووە مافی هەمو تاکێکیش بدا چ جای نەتەوەیەک هەتا ئێرە هەموو لایەکمان کۆکین لەسەر مەزڵومێتی میللەتی کورد و هەوڵدان بۆ بە دەست هێنانی مافەکانی .بەڵام چۆن و بەکام بیرو بڕوا جۆری خەبات و تێکۆشان ئالێرەدا جۆرە لێک حاڵی نەبوونێک هەیە لەنێوان ئیسلامی و نەتەوەیەکانەوە .**

## (کەخاڵە لاوازوو بەهێزەکان لێرەوە دەست پێدەکەن)

## (خاڵەلاوازەکان)

بەبیروو بڕوای من خاڵەلاوازەکانی ئێمە لەو خاڵانەدا خۆی دەبینێتەوە :

1- ئەگەر سەیری مێژوی میللەتی کوردو شۆرشەکانی بکەین زۆربەی هەرە زۆری سەرکردەکانی شۆرشەکان و شاعیران و هەڵ کەوتوانی ئەو میللەتە دەرچوی مزگەوت و حوجرەو خانەقاکان و خاوەنی فکرەی ئیسلامی بوون . کەواتە ئاینی ئیسلامی پیرۆز بوە هاندەری سەرەکی بۆ بەدەست هێنانی مافەکانی میللەت و ئازاد کردنی نیشتیمان. لەگەڵ ئەوەش دا ئەوانەی خاوەنی بیروو بۆچونی عیلمانین زۆر بە بێ ویژدانی هێرش دەبەنە سەر ئیسلام و ئیسلامیەکان و بەکۆنە پەرست و دواکەوتوو ناویان دەبەن و بەهۆکاری دواکەوتوی میللەتەکەیان لەقەڵەم دەدەن .سەرکردەخەبات گێرەکان بەپیاوی ئاینی ناوو نابەن و زۆر جار نازناوی مەلاوو شێخ یێش لەکاتی ناوو بردنیان لادەبەن و پێیان وایە ئەونازناوەیە هۆی کەمی ئەوسەرکردەیە وەک . شێخ محموود .شێخ سەعید. شێخ عبداللە. شێخ عبدالسلام . پێشەوا قازی . تا ....... هتد و چەندین هەڵ کەوتوی تری میللەتەکەمان .

2- لەئەنجامی بەوجۆرە بیرکردنەوەیەدا هەندێکیش لەئیسلامیەکان زۆر بەبێ ویژدانی باس لەخەبات و تێکۆشانی ئەوانە دەکەن کەفکرەی ئیسلامی یان نیە . نازانن کەئێمە خاڵی هاوبەشمان زۆر زیاترن لەخاڵی ناکۆک و جیاواز. هەرکەسێک شۆرشی کردبێ و پێشمەرگایەتی کردبێ ولەوشاخەنەدا قوربانی دابێ جێگەی رێزوو تەقدیرە. ئەو جۆرە بیرکرنەوەیە بیرکرنەوەیەکی سەقەتەو خاڵی لاوازی نێوان ئیسلامیەکان و علمانیەکانە.

3- یەکێکی تر لەخاڵە لاوازەکان . یەکترموتتەهەم کردنە بەپیاوی بێگانەو هەریەک لەو دوولایەنانە زۆر جار یەک تری عەیب دار دەکەن بەهۆی ئەوەی کەفلان بەکرێ گیراوی فلان لایەن و وڵاتە یە. مع العلم لەوانەیە زۆر جار نەبوونی پەیوەندی لەگەڵ فلان دەوڵەت و فلان لایەن

بوبێتەهۆی بەهێزبوونی پێگەی میللەتەکەما ن .

4– یەکتر نەخوێندنەوەو حەسادەت بەیەک تربردن و وادابنرێ دەبێت هەرمن هەبم و کەسی تر نەبێ و کەسی تر شیاوو نیە بۆگرتنەدەستی ئەو پۆستەیەو بەرێوەبردنی ئیداریات و..هتد

5– نەبوونی راست گۆیی لەنێوان یەک تردا . لەسەر خاڵە بنەرەتەکان و یەک لای نەبونەوە بۆ بەدەست هێنانی بەرژەوەندییە گشتیەکان ئەمەو چەندی تریش .

## خاڵەلاوازەکانی نێوان ئیسلامیەکان

1– تێنەگەشتنی راستەقینەی تاکەکان لەدەق . واتە : ئایەت و فەرموودەکانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلام)نەگەرانەوە بۆ بنچینەی ئەو فەرموودانەو وەرنەگرتنی وانەکانی چیرۆکەکانی قورئان و روداوەکانی رابردووەکان .

2– وەرنەگرتنی مەفهومی . سەلەفیەت و جیهاد و سۆفیەت و پەروەردەو سیاسەت و ئیدارەو کۆمەڵایەتی و رۆشن بیری و سەربازی و دارایی و ..هتد.

3– کورت کردنەوەی مەفهومی ئیسلام لەیەکێک لەوانەدا و شوێن کەوتوانی سەلەفی وابزانن ئیسلام یانی ئەوسەلەفیەی کەئەوان وەریان گرتوە بەو شێوەی کەئەو لێی حاڵی بون . سۆفیەکان وابزانن ئیسلام یانی خانەقاوو تەکێ و خەتم کردن و چەن ذیکرێک شەوانەو رۆژانە کەئەنجام دەدرێت جیهادیەکان مانای جیهاد کورت هەڵبێنن لەکوشتن و بڕین ئیسلاحیەکان مانای ئیسلاحی کورت بکەنەوە لەپەروەردەی دەرونی و بەهێزبونی تاک لەگەڵ خواو وابزانن ئیسلام یانی تەنیا بەهێزبونی نێوان خۆت و خواتەو پێویستی بەئیداراتەوە نیە . بەراستی ئیسلام گشت گیرەو دەبێ هەموو ئەوانە لەمرۆڤی موسڵمان دا رەنگ بداتەوە . ئیسلامی دەبێ سەلەفی بێ و سۆفی بێ و جیهادی بێ و ئیسلاحی بێ و سیاسی بێ و کۆمەڵایەتی بێ و رۆشن بیر بێ و راهید و نیشتیمان پەروەروو خاوەنی عەقیدەیەکی راستەقینەبێ . لەکۆتایی دا پێویستی بەیەکێک لەوانە هەبێ

دەبێ لەویدا ئەوسیفەتە مەوجود بێ و بەکاری بهێنێ . ئەوانە زەرورن بۆ مرۆڤی موسڵمان بەتایبەتی مرۆڤی ئیسلامی.
4- تێنەگەیشتن لە چەمکی حزبایەتی و بیرکردنەوەی تەسکی حزبایەتی و پێگەیاندنی تاک بۆ حیزب نەک بۆ ئیسلام و وەرگرتنی حیزبایەتی وەک هەدەف نەک وەسیلە بۆگەیشتن بەئامانجەکان .
5- پیرۆزی تاک لەناو حیزب دا بەشێوەیەکی وا هەڵەکانیشی هەر بەحیکمەو و لێهاتوی سەیر بکەی بەمرۆڤێکی مەعسومی بزانی . ئەوانەو چەندی تریش .

**(خاڵە بەهێزەکان)**

1- ئیسلامیەکان و علمانیەکان جۆرە لێک حاڵی بونێکیان بۆ دروست بوە لەبەڕێوەبردنی ئیداریيان هاو بەشی لەپرسەسەرەکیەکانی نیشتیمانی و دابەزین بەیەک لیست لەپەرلەمانی کوردستان لە دام ودەزگاکانی حکومەت داو بەخەمەوە بونی مەسئەلە چارەنوسە سازەکانی کوردستان .لەناوو خۆ و دەرەوەدا.
2- بەهێزبونی نێوانیان لەروی سیاسی و حیوارو گفتوو گۆکردن بەشێوەیەکی مەدەنی لەدام و دەزگاکانی راگەیاندنیان دا .
3- ئیسلامیەکان لەنێوان خۆیان دا هەوڵی جدی دەدەن بۆ زیاتر لەیەک نزیک بونەوەو لەیەک تێگەیشتن و دانانی لیژنەی هاوبەش بۆ مەسئەلە سیاسیەکان .
4- یەک هەڵوێستیان لە پەرلەمان و حکومەت دا لەسەر بنەما نەگۆرەکان و داکۆکی کردنیان لەبنەما نەگۆرەکانی ئیسلام .
5- سوپاس بۆ خوا هەوڵی جدی دراوە و دەدرێ لەسەر هەرگرفتێک کەلەنێوانیان دا رویدابێ و چارەسەر کراوە .
6- سوپاس بۆ خوا تاکو ئێستاکە گرفتی وا لەنێوانیان دا رووی نەداوە کەچارەسەر نەکرێ وە لێک بترازێن کە إنشاالله قەت ئەوە نابێ .

---

## وەڵامی هەندێک لە مامۆستایان و بانگخوازانی بەڕێزی شاری کەلار

**ئامادەكراوە لە لایەن برای بەڕێزم:**

**كاك كوڕێكی هەژار**

الحمدلله رب العالمین واصلاة واصلام علی رسوله الأمین وعلی آله وصحبه أجمعین ومن تبعهم بإحسان الی یوم الدین.

**بە پێنوسی كوڕێكی هەژار**

سوپاسی بێ پایان بۆخوای پەروەردگاری جیهانیان ، وە دورودو سەلام برژێت بەسەر گیانی پێغەمبەری پێشەواماندا وە ئالوبەیتی و شوێن كەوتوانی تارۆژی دوایی آمین .
برایان و خوشكانی ئیمان دارم من خۆشحاڵم بۆیەكەم جارمە لەكارێكی وا بانگخوازیدا بەشداری دەكەم كارێكی زانستیە بۆ یەك گرتنە وەی مسوڵمانانی خۆشە ویست چ لەكوردوستان وچ لەدەرەوەی كوردوستان وچ مسوڵمانانی جیهانیش إنشاالله أمابعد.
لەسەر ئەو راپرسیەی كە لەماوەی مانگی ڕابردوودا لە دەرەوەی كوردوستان لە لایەن چە ند برایەكی خۆشە ویستەوە خۆش بەختانە تەشەنەی كردوو كوردوستانیشی گرتەوە منیش وەكو مامۆستاكانم فێریان كردووم وەكو خزمەت كارێكی ئیسلام هە ستام بە راوێژكردن لەگەڵ مامۆستایانی ئاینیدا ئە وانیش زۆربە گەرمی هاتن بەدەنگ راپرسییە كەمانە وە خوای پەروەردگار پاداشتی بەخێریان پێ ببە خشێت أمین.

---

## یەکەم: بەڕێز مامۆستا ئارام کە لاری مامۆستاو بانگخواز

بسم الله أبدأ وبه أستعين

زۆرجار ئایدۆلۆژیەکان ناچنەبازنەی پراکتیک وجێبەجێ کردنەوە یان هەندێ جارزۆرسەرکەوتوانەکاریگەری لەسەرژیانی تاک و کۆمەڵگادروست دەکەن وەهەندێ جاریش هەرئەوتاک وکۆمەڵگەیە هەمان ئایدۆ لۆژیابایکۆد دەکەن لەژیانی پراک تیکی خۆیان, هەڵبەتە دوور خستۆتەوە وەبایکۆد کردنی هەرئایدۆلۆژیایەک لەژیانی ئاسایی خەڵک دایان لەبەربێ توانایی وبێ کەڵکی ئایدۆلۆژیایەکەیە یان بێ لێهاتوی هەڵگرانی شوێن کەوتوانی  ئایدۆلۆژیاکە یە ئەمە ئەکرێت ئاین بێت یان بە پێچە وانەی میتا فیزیک واتە پڕاو پڕمادە گەرایی بێت بەهەرحاڵ ئەمە ڕوویەکی گشتیە بۆهەربیرو ئایدیایەک بەڵام گرفت ئەوەیە ئەم جارە نەهەڵەوکەم و کوڕی لەخودی ئایدیاکەدایە نە ئەو واقیعییەی کەبیرو ئایدۆلۆژیایەکەی بۆڕەوانە کراوەو بۆی داڕێژراوە، قسەم لەسەر ئیسلام نیە کەئەوانەیشی نەیارانە مامەڵەی لەگەڵ  دەکەن بێگوومانن لەپری و تەواوی شیاوی! قسەلەسەر پەرت وکەرتی موسڵمانانە واتە هەڵ گرانی ئیسلام نەک ئیسلام وەک بەرنامە ئەمە پرسیاری قوڵایی ناو دڵە پڕ ئازار ەکانی هەرمسوڵمانێکی گەشبینە بەئیسلام و بەرنامەکەی، باشە ئەگەر ئیسلام وەک بەرنامە پاک و بێگەردوو شیاوە ئەم پەرت و کەرتی مسوڵمانان لە پای چی؟

ئەمە سەری گرێ کوێرەیەکە کە لە کردنەوەیدا هەمووانی تووشی شۆک کردوە وەڵاهی سادە ترین مسوڵمان(عەوام) هەتا زاناترین و بیرمەند ترین و فەیلەسوفەکانیش بچڕانی ڕۆحی و دەروونی تەواو لە نێوان مسوڵمانان و بەرنامەکەیان دا هۆکاری هەموو گێژاوێکی ناتەواوی و کەرت و پەرتی یە ئەمەراستە بەڵام چۆن گرێ بدرێنەوە لەگەڵ ئیسلام دا بەوەی ناوی ئیسلام و موسڵمان بوون دووبارە لەخۆمان بنێنەوە یان قورئان و سوننەت بکەینە مارشی دەسپێکەکانمان یان دروست کردنی

**مەرجەعێک لەعەقڵێتەکانی گەورە پیاوان و دونیا دیدەکان یان حوکمی ئیسلام و قورئان و سوننەتیش بکەینە مانشێتی نوسراوەکانمان بۆ ئەوەی لەرەوت وو رێم و جەوهەری حوکم بگەین ئەمانەو چەندانی تر لەدواندن لەئارادایە بۆ شارەزابوون لەشێوازی گرێ کوێرەکە نەک کردنەوەی ئەی بۆناکرێت؟ هەر ئیسلام گرێ کوێرەکەو هۆکەشی پێ وتوین.**

**مەگەر نەمان بینیوە یان نەمان بیستوە پێغەمبەری ئەکرەم (صلی اللەعلیە وسلم)فەرموویەتی** (يُوشِكُ الأُمَمُ أَنْ تَدَاعَى عَلَيْكُمْ كَمَا تَدَاعَى الأَكَلَةُ إِلَى قَصْعَتِهَا)**کەمیللەتان ئایدیەنەیارەکانی ئیسلام هێرشتان دەکەنە سەر هەروەک چۆن بخۆرەکان بۆسەر قاپ و مەنجەڵی خۆراک یان ووتیان ئەی پێغەمبەری خوا (صلی اللەعلیەوسلم) هۆی بێدەسەڵاتی ئێمە لەو رۆژەدا کەمبوونمانە؟ فەرمووی: نا زۆرن هەروەک کەفی سەر دەریا وان واتە: هۆکاری بێدەسەڵاتیتان کەمبونتان نیە وەزۆرن بەڵام هۆکاری پەرت وکەرتی بێدەسەلاتی و ناتەبایی ئەمەیە**(حُبُّ الدُّنْيَا وَكَرَاهِيَةُ الْمَوْتِ) **خۆش ویستنی دنیاو رق بونەوە لەمردن ئەمەدەستە واژەیەکی مەعریفی و فەل سەفی گەورەیە بۆ چارەسەر واتە کردنەوەی گرێ کوێرەکە، ئێوە پێم بڵێن مەگەر ئێستا تەرجەمەکراوی واقیعی ئەودەستە واژەیە نیە کەتیایدا دەژین با ئەمن یان تۆ چۆن لەودەستەواژەیە تێبگەین؟ پێچەوانەی کەینەوە وەک خۆی واتە(حب الموت وکراهیة الدنیا)مردنمان خۆش بوێت و ڕقمان لە دونیا بێت بەواتای دەستەوەستان چاوەرێی مردن بکەین پشت لەهەموو تاکتیکە رۆحیەکان بکەین و هەموو ئامرازەکانی دنیای پێشکەوتن وەلا نێن، نە چارەسەری کێشە هەڵپەسێراوە دەرونیەکانمان نەبەر جەستەیەکانی خۆمان و خەیری خۆمان بکەین لەکاتێک دالەدونیای بونی ئیسلام دا تەواوی لەم پەڕە رۆحی تاک و کۆمەڵگاوو سوڵحاوو دەکات یان هەریەک لە ئێمە کۆن تاکی رۆحی خۆی لەگەڵ ئیسلام دا بکاو پەروەردەیەکی پتەوی بداتێ بەشێوازێک رەنگ دانەوەی ئەخلاقی تاک پاشان کۆمەڵگا بداتەوە هەروەک ئەوەی( سەیدی شەهید)**

ئەفەرموویێت دەوڵەتی ئیسلام لەدڵتاندا دروست بکەن دەوڵەتی ئیسلام لەسەر زەویتان دا دروست دەبێت کەواتە پاپەند بون چارەسەرە بەڵام کام پاپەند بون؟ ئەوەی نویژەکانی من هێرش شکاندنی کەسایەتی تۆ بێت و سرینەوەت لەجوگرافیای (ئەنترۆپۆلۆجیدا) و موزایەدەی دینی بەسەرەوە بکەم من لە تەئمینی فیردەوسی ئەعلا و تۆش لەناوو گێژاوی نەفسی(ئەمارە)یان راست کردنەوی هەڵە ئەخلاقیەکانی خۆم ؟

---

## دووەم: بەڕێز مامۆستا مەلا فرج سعید صالح لەدەڤەری گەرمیان پێش نوێژی مزگەوتی غەزالی لە {کەلار}

بسم الله الرحمن الرحیم

**هۆکارەکەی نەبونی تاکی موسوڵمان بەوشێوە یە کەئیسلام داوای دەکات.**

من وادەزانم دەگەرێتەوە بۆئەوەی ئێمەی موسوڵمان،وەک یەکێک لەزانایانی هاوچەرخ ئەفەرمووێ: باوەڕبونمان بەشەریعەتی خوا،بەم ئیسلامە باوەر بونێکی زارەکیەو، نەبووەتەحاڵ،نورێک دڵمانی پرکردبێت،خوای پەروەردگار لەم ئایەتە پیرۆزەدا دەفەرموێت: **(وما أرسلناک إلارحمة للعالمین}**دەفەرمووێ: ناردنی محمد المصطفی،ناردنی شەریعەتی خوا یە کە ئیسلام رەحمەتە بۆمرۆڤایەتی،ئەم ڕەحمەتە کافریش دەگرێتەوە،کەواتا هۆکاری کەمی تاکی موسوڵمان و کاری گەری نەبوونی موسڵمانان لەسەر کەسانی دوورلەخواوبێباوەرنەبونی ئەم حاڵەتەیە،کەئیمانەکەمان،نەبووەتەحاڵ و لەجیهانی واقع و ،کرداروگوفتارماندا رەنگ دانەوەی کەمە.

ئێمەی موسوڵمان ئەبێ والەم شەریعەتە تێبگەین کەبۆبەرژەوەندی مرۆڤ هاتووە،بەرژەوەندی مرۆڤیش دووشتە

**یەکەم:** دوورخستنەوەی زەرەروزیان لێی.

**دووەم:** هێنانی خێرو رەحمەت و بەرەکەت سودگەیاندن پێی،تاکی موسوڵمان گەر بەم جۆرە بروانێتە ئەم دینەی خوا هەر یەکێکمان دەبینە

بانگ خوازێک بۆ ئیسلام،وەک جیلی یەکەم و دووەمی ئەم میللەتە.

لەم ڕوانگەوە دەتوانین بڵێین: نەبونی ئەم جۆرە تێگەیشتنە لەلای زۆرینەی موسوڵمانان،هۆکاری نەگەراندنەوەی کارەکانمانە بۆکیتاب و سوننەت.

---

## سێ یەم: بەڕێز مامۆستا سه نگەر مامۆستاو بانگخواز

بسم اللهالرحمن الرحيم
الحمد لله رب العالمين و الصلاة والسلام على رسول الأمين سيدنا وحبيبنا محمد (صلى اللهعليهوسلم) وعلى الهوأصحابه الطيبين الطاهرين ومن تبعهم بإ حسان إلى يوم الدين

### هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆنەبوونی پێشه وا:

دیارە ئاڕاستە کردنی مرۆڤە کان بە هەموو مەفهومە جیاوازەکانی ژیان لەهەموو سە ردەمەکاندا ،دەگەرێتەوە بۆئەوکەسانەی کەئەتوانن ڕێژەی تاکەکان بەئاراستە جیاوازەکان ئاڕاستەبکەن، جاهەرچۆنێک بن بەنموونەی ئەم سەردەمەش،کەپریەتی لە ژیانێکی جەنجاڵ وئاڵۆز، بەهەموشێوەیەک لەگەڵ ئەم هەموو ئەقالیبە نوێیانەدا ئەگەربێت و مرۆڤەکان بەشێوەیەکی باش ئاراستە نەکرێت ئەوە کاریگەری لەسەر مرۆڤ و ئەوپێک هاتە ئاینیە دەبێت کەمرۆڤە کان پەیوەستن پێیەوە زۆرتر کاریگەری دەبێت لەسەری و بەرەو کزی ئیمانی دەبات.

---

## **چوارەم: بەڕێز مامۆستا علی خان مامۆستاو بانگخواز**

بسم اللەرلرحمن الرحيم

إن الحمدلله نحمده ونستعينه ونستغفره ونعوذبالله من شرور أنفسنا ومن سيئات أعمالنا من يهده الله فلامضل له،ومن يضلل فلا هادی له، وأشهد أن لا أله إلا الله وحده لاشريک له،وأشهدأن محمداعبده ورسوله أما بعد:

پرسیاری ئاراستە کراو

**- هۆی پشێوی وناتەبای نێوان موسڵمانانی ئەمرۆدەگەرینیتەوە بۆچی ؟**

**بەپشتیوانی وتەوفیقی خوای تەعالا ئەڵێین:**

باسکردنی یەکرێزی ویەک پارچەیی ئیسلامی یانی : باسکردن لەئیسلامە وە ، باسکردن لەبارەی ئومەتی ئیسلامەوە .

ئەوەش لەئاراستە کردنی ئەم پرسیارانە دەخوێنمە وە کەوا کۆمەڵێک دڵسۆزوخەم خۆرهەن وئەیانەوێت چارەسەرێکی زانستی بۆئەم دووبەرەکیە وناکۆکیەبدۆزنەوە. ئەیانەوێت هەنگاوێک بەرەوساڕێژکردنی تەفرەقەوئیختیلاف هەڵگرن،کەئەم ئومەتەمانی تەواو لاواز کردووە ، ئاراستە کردنی ئەم پرسیارە لەکاتێکدایە، دەیان تکتل هەیە، دەیان کۆمەڵ هەیە، دەیان بانگە واز هەیە، دەیان مەنهەج هەیە، **(وکل حزب بمالديهم فرحون)**. بەراستی هەورێکی واتاریک ئاسمانی جیهانی ئیسلامی داگرتۆتەوە،واخەریکە ڕوناکی هەقیقەت لەزۆرێکی خەڵک دەشارێتەوە، موسڵمانان بەهۆی هێرشەفکریەگوماناویەکانەوە کەوتونەتە گێژاویکەوە، سەرگەردانیەکەوە، مەگەرخواخۆی بزانێت، لەکاتێکدایە کەریزەکۆکەکەی موسوڵمانانی تێداکەرت بووە، یەک قسە یی یە ڕونە و ڕوناکیە کەیانی تییا جیاواز بوە، کەسایەتی ساغ وسەلیمی ئیسلامی تێدازایەبووە، وای لێهاتووە هەم دوژمن ڕوی تێکردوون، هەم دۆست پشتی تێکردوون و لەکاتێکدایە، موسوڵمانان ووڵاتیان داگیر کراوە، سەروەت و سامانیان بەتاڵان براوە ، بێ ڕێزی بەرامبەر پیرۆزیەکانیان کراوە، هەمو دونیاش

کەخۆی لەنەتەوە یەکگرتوەکان دەبینێتەوە بێدەسەڵاتی خۆیان ڕاگەیاندووە،کەواناتوانن هیچ هاوکاریەک پێشکەش بکەن،ئەگەرچی هەقەکەش ڕون بوبێتەوە، ستەم کارەکەش بناسرێتەوە،وەختە وامان لێبێت، یان وامان لێهاتووە،سەرباری زۆری ژمارەمان کەس لامان لێناکاتەوە، بوین بە شوێنکەوتە بەڵکو مقلیدی غەیری خۆمان بەبێ ویستی خۆمان.

## چار چی یە ؟

هەمو ژیرەکان و خاوەن علیمەکان و دینەکان کۆکن لەسەر ئەوەی کە،(**لایصلح آخرهذه الأمةإلابماصلح به أولها**) بەڵێ،ئامێزی ئەم ئومەتە باش نابێت مەگەر بەوەنە بێت کەسەرەتا کەی پێ چاک بو ،ئەویش (**ماأنا عليه اليوم وأصحابي**)کە دەلیلیش شوێن کەوتنی رێبازی سەلەفی ساڵح مانە ،ڕەزاورەحمەتی خوایان لێ بێت،

*  *  *

کەباسی ئەوەدەکەین: ئەمرۆ موسوڵمانان پەرتەوازە بون دەبێت ئەوەمان لەبیر نەچێت کەئیسلام هەوڵی زۆری داوە یەک ریزی وتەبایی وبرایەتی نێوموسڵمانان بپارێزێت،تەنانەت هەر شتێکیش بوبێت بەهۆکاری نایەک ریزی و پەرتەوازەیی و ناتەبایی رێگری لێکردووە،سزای لەسەر داناوە،بەقێزەون ناوزەدی کردووە،تەنانەت دەبینیت هەرچی دەرگاوپەنجەرەی دووبەرەکی و ناکۆکی هەیە دای دەخات و هۆشیاریش دەدات لەکردنەوەی، دەست خۆشیش دەکات وئەجرو پاداشتیش دادەنێت بۆهەر کەسێک پارێزگاری بکات لەهۆکارەکانی یەک ڕیزی و پێکەوە ژیان:

لەوانە : _دەبینی : غیبیات و قسەهاوردن و بردن حەرام دەکات:

چونکە ئاسەواری خراپی هەیەلەسەر پە یوەندیەکانی خەڵک،دژی تەبایی وبرایەتین،پەیام بەری خوا صلی اللەعلیەوآلەوسلم دژی دەوەستێتەوە،هەروەک لەصەحیحەیندااهاتوە لە ئەبی بەکرەوە و لە إبن عباس وابن عمرەوە کەلەکۆچی ماڵ ئاوایدا فەرمویەتی: "**فإن دماءكم**

**وأموالكم واعراضكم، حرام عليكم، كحرمة يومكم هذا، في شهركم هذا، في بلدكم هذا، فأعادهامرارا"**، خوێن ومالّ وناموستان حەرامەلەسەریەکتری، وەکوحەرامێتی ئەم رۆژومانگ وشارە، چەندجاری دوبارەکردەوە، تەماشاکەدەبینیت لەدواساتەکانی ژیانیشیداهەرخەمی برایەتی وتەبایی نێو موسڵمانان بووە، چەندجارەش دووبارەی دەکاتەوە لەبەرئەوەی باش برواتەگوێیانەوە، باش وەری بگرن، لەبیریان نە ڕوات، حەدیسی تر زۆرن لەم بارەوە بۆتان بێنین.

هەروەهادەبینی: دەمەقاڵەوموجادەلەی بەخراپ باسکردووە:

چونکەئەمیش دەبێتە هۆی کزبونی برایەتی، شێواندنی تەبایی، هەروەک لەسونەنی ترمذی ومسندی أحمدداهاتووەبەسەنەدێکی حەسەن، لەئەبوئومامەوە کەواپەیام بەری خوا فەرمویەتی: **"ماضل قوم بعد هدى كانواعليه إلاأوتوا الجدل "..** هەر ترمذی لەمەوە بەسەنەدێکی حسن ڕیوایەت دەکات کە پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمویەتی: **من ترك المراء وهو مبطل بني له بيت في ربض الجنة ، ومن ترك المراء وهو محق بني الله له بيتا في أعلى الجنة)**

هەروەها دەبینی : نەهی دەکات لە رق لەیەک بون وسەردانی یەکترنەکردن ومونافەسەی یەکترکردن:

ئەمە ش مە علومە ئاسەواری خراپە چەندقاتە، و برایەتی ناهێڵێت، هە روەک؛لە صەحیحەینداهاتوە لە حەدیسە کە ی ئە نە س بە مەرفوعی. ، **"لاتباغضوا، ولاتحاسدوا، ولاتدابروا، (ولاتنافسوا)وكونواعبادالـ لەإخوانا، ولايحل لمسلم أن يهجرأخاه فوق ثلاثةأيام"** لەمسلم یشداهاتووە لەئەبوهورەیرەوە کەوا پێغەمبەری پێشەوامان فەرمویەتی**"تفتح أبواب الجنةيوم الأثنين ويوم الخميس، فيغفرلكل عبدلاشريك بالله شيئا، إلارجل كانت بينه وبين أخيه شحنإ فيقال انظروا هذين حتى يصطلحا ..**

هەروهادەبینی: نەهی کردووە لەبەکەم تەماشکردنی موسڵمانان وگاڵتە پێکردن وسیخوڕی کردن بەسەریەکەوە وگومانی خراپە پێبردنی:

**خوای مەزن دەفەرموێت:** (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آَمَنُوا لَا يَسْخَرْ قَوْمٌ مِنْ قَوْمٍ عَسَى أَنْ يَكُونُوا خَيْرًا مِنْهُمْ وَلَا نِسَاءٌ مِنْ نِسَاءٍ عَسَى أَنْ يَكُنَّ خَيْرًا مِنْهُنَّ وَلَا تَلْمِزُوا أَنْفُسَكُمْ وَلَا تَنَابَزُوا بِالْأَلْقَابِ بِئْسَ الِاسْمُ الْفُسُوقُ بَعْدَ الْإِيمَانِ وَمَنْ لَمْ يَتُبْ فَأُولَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ) **(الحجرات/١١) لەموسليمدا هاتووە لەئەبو هورەيرەوە ،پێغمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)فەرمويەتی:" بحسب إمرئ من الشر أن يحقرآخاه المسلم" لە صەحيحەينداهاتوە هە رلە وە وە، پە يامبە ر(صلى الله عليه وسلم) فەرموويەتی:"إياكم والظن فاءن الظن أكذب الحديث" وە لە سننی أبوداوداهاتوو ە إبن مسعودوتويە تی(نهيناعن التجسس، إن يظهرلناشئ نأخذبه)**

**هە روە هادە بينی ،نە هی كردوە موسڵمان خۆشحاڵی دە ربڕێ لە ئاست بەڵا بە سە رهاتنی برای موسڵمانە كە ی، چونكە كە وات كرد براكە ت لێت زويردە بێت،برايە تيتان تێكدە چێت. هە روە ها لە سننی ترمذ ی داهاتوە بە سە نە دێك كە ضعفێكی تێدايە.لە وائيلە ی كوری ئە سقە عە وە،بە مەرفوعی.{لاتظهرالشماتة لأخيک، فيرحمه الله ويتبليک،تە نانە ت پە يامبە ر دە فە رموێ{من حمل علیناالسلاح فليس منا} هەروەها {من غشنا فليس منا }،دەبينی ئيسلام شوێن كەوتووانی لەهەرچی شتێک بەدووردەگرێت ،نەهييان لێدەكات لەوشتانەی كەدووبەرەكی و ناتەبايی تێدايە دەكەوێتەوە يان هەرشتيک پەيوەندی نێوان موسڵمانان ببچڕێنێت يان كزی بكات بەڵكو رەسولی خوا زۆرڕقی لەتەفرەقەو ئيختيلاف بووە،هۆشداری زۆريداوە لەئاقيبەتی شوم و خراپ تەنانەت هەرديارەدەيەكيشی بەرچاوكەوتبێت تەفرەقەوخۆجياكردنەوەی تێدابوبێت ڕوبەڕوی وەستاوەتەوە ئەم حەديسەش بخوێنەوە كەبەخوای گەورەگەربەئاوی ئاڵتونيش بنوسرێتەوە هێشتاكەمە، لەئەبوثەعلەبەی خوشەنيە وە دە ڵێت {كان الناس أذانزلوامنزل تفرقوافی الشعاب والاودية } فقال رسول الله {صلى الله عليه وسلم}" إن تفركم في هذه الشعاب والاودية، إنما ذالكم من الشيطان ،فلم ينزلوا بعد منزلا إلا انضم بعضهم إلى بعض ،حتى لوبسط عليهم ثوب لحمهم "صحيحه**

الألبانی وشوعیب الأرنؤوط. تەنانەت ئینکاری ئەوکەسە دەکات لەنوێژی جەماعەت پێش پێشەوا بکەوێت ،لەصەحیحەیندا هاتوە لەئەبوهوریرەوە بەمەرفوعی...**أمایخشی أحدكم أحدكم إذارفع رأسەقبل الإمام،أن يجعل الله رأسه رأس حمار، أويجل الله صورته صورة حمار "** ئاوهائەوکەسە دەترسێنیٚ،ئاوهادەی تۆقێنێت کەخۆی جیانەکاتەوە لەناوموسوڵمانان،ئەگەرچی بەسەر بەرز کردنەوەیەکیش بێت ،ئەگەرچی عیبادەتیش بکات،بەڕاستی پاراستنی یەک ریزی ئیسلامی و هێشتنەوەی کۆمەڵەکەی و تاکەئوممەتەکەی بەعیبادەتێکی گەلێک مەزن هەژماردەکریٚ.

جاچۆن ئیسلام ئینکاری هەرشتێک دەکات ئیختیلاف وتەفرەقەی لیٚ بکەوێتەوە ئاواش هانی موسڵمان دەدات بۆبرایەتی و تەبایی و خۆشەویستی و یەکڕیزی لەپێناوی خوادا . لەمسندی أحمد و سننی ترمذی و مستدرکی حاکم دا هاتووە بەسەنەدێکی صحیح لەمعاذی کوری جەبەلەوە پێغەمبەرفەرموویەتی:پەروەردگار فەرمویەتی:**"المتحابون في جلالي لهم منابرمن نور،يغبطهم النبيون والشهداء .**

هەروەهادەبینی:هانی موسڵمانان دەدات تە وقەبکەن لەگەڵ یەکترداو دەم بەپێکەنین بن،

شاراوەنیە ئەم کارە چەند ئاسەواری ئیجابی دەبێت لەسەریادکردنی برایەتی و دۆستایەتی لەنێوان موسڵماناندا،لەبەرائی کوری عاذەبەوە هاتووە بەسەنەدێکی حسن – هەروەک أحمد و ترمذی وئیبن ماجە ڕیوایەتیان کردووە پێغەمبەری خوا فەرموویەتی:**" مامن مسلمين يلتقيان،فيتصافحان إلاغفر لهما قبل أن يتفرقا"**وە هەروەها دەفەرمووێ : **(وتبسمک في وجه أخيک صدقة )** هەروەها مافیان دەدات سەلامی یەکتر بکەن چونکە خۆشەویستی لێدەکەوێتەوە **((ألا أدلكم على شيء إذا فعلتموه تحاببتم بينكم أفشوا السلام بينكم ))** هەروەها دەبینی : هانی موسڵمانان بۆ تەبای و هاوکاری یەکتری و سەرخستنی یەکترو توندو تۆڵ کردنی کۆمەڵی موسڵمانان .

**خوای گەورە دەفەرمویێت :" وَتَعَاوَنُوا عَلَى الْبِرِّ وَالتَّقْوَى وَلَا تَعَاوَنُوا عَلَى الْإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ" (سورة المائیدە/2). لە صەحیحەیندا هاتوە لە حەدیسەکەی أبو موسای ئەشعەری پەیامبەری خوا فەرمویەتی: (إن المؤمن للمؤمن کاالبنیان یشد بعضه بعضا وشبک بین أصابعه ) لە صەحیحی مسلمدا هاتوە ، لە نعمانی کوری بەشیرەوە کەوا( پەیامبەر صلی الله علیه وسلم ) فەرمویەتی : ( مثل المؤمنین فی توادهم وتراحمهم وتعاطفهم کمثل الجسد الواحد ،إذا اشتکی منه عضو ،تداعی له سائر الجسد بالسهر والحمی ). ئا بەوشێوە دەبینی موسڵمانان هەرهەموویان دەشوبهێنێت بە یەک جەستە مەعلومە یەک جەستەش کاتێک شوێنێکی دەیەشێت ، تایەکی ئەبێت ، ئازارێکی ئەبێت هەمولاشە پێوەی دەناڵێنێت بەڵێ ، کەموسڵمان لەوپەڕی دونیا بە ناهەق ئازار دەدرێت ، بە ناهەق دەکوژرێت ،ئەتک دەکرێت ، زۆرم پێناخۆشە گەردەستەڵاتیشم هەبێت بە واجبی سەرشانمی و دەزانم بەرگری لێبکەم بەگیان و دڵ – ئەمەش زمانی حاڵ و مەقامی هەموو موسڵمانێکی دڵسۆزە –**

**إذا أشتکی مسلم فی الهند أرقني وإن بکی مسلم فی الحین أبکاني**
**مصر ریحانتی والشام نرجستي وفی الجزیره تأریخیی وعنواني**
**أری بخاری بلادی وهي تائیة وأستریح إلی ذکری کردستان**
**وأینما ذکر اسم الله في بلد عددت ذاک الحمی من حلب أوطان**

**ـ تەنانەت دەبینی هانی موسڵمانان دەدات نارەحەتی و تەنگ و چەڵەمەی لەسەر براکانی خۆیان لابەن ، کار ئاسانییان بۆ بکەن ، یارمەتیان بدەن ، تەماشای ئەم فەرموودە حەسەنە بکە، کەلە صحیصی مسلم دا هاتوە لە حەدیسەکەی أبو هوریره ، لە( پەیامبەری خوا صلی الله علیه وسلم ) فەرمویەتی : ( من نفس عن مؤمن کربة من کرب الدنیا ،نفس الله عنه کربة فی کرب یوم القیامه ،ومن یسرعلی معسریسرالله علیه في الدنیا والأخرة ، والله في عون العبد ماکان العبد فی عون أخیه )....**

**بەڵێ ،(( انصر أخاک ظالما أومظلوما )) لە ئیسلامدا کاری پێ دەکرێت**

**لە هەموو کاتدا هەر ئەبێ سەری بخەی بەڵام . لە صەحیحەین دا هاتووە لە حەدیثەکەی جابری کوری عبدالله و ئەنەسی کوری مالیک کەوا پەیامبەری خوا (صلى الله عليه وسلام) فەرموویەتی براکەت سەربخە ،ستەمکار بوو یان ستەم لێکراو بوو ، صەحابەش پێیان سەیر بوو ، زانییان مەزڵوم بۆچی سەردەخەن ، ئەی زاڵم بێت چۆن ؟ !**

**فەرموی (( يحجزه أو يمنعه من الظالم فإن ذالک نصره)) دەیگێڕێتەوە ، ڕێگری لێدەکات لەوەی ستەم بکات ، ئائەوە سەرخستنیەتی . هەربۆیە ڕەت دانەوەی ئەهلی بیدعەو خورافات و خاوەن بیرۆکە خراپ و ڕوخێنەرەکان بە هیچ شێوەیەک لە تەفرەق و ئیختیلاف هەژمار ناکرێت ، بە مەرجێک واجبی برایەتی بپارێزێت و ستەمی لێنەکاو بوختانی بۆنەکاو لەبەرخوا وەڵامی بداتەوە نەک لەبەر بنەماڵەکەی ، یان نەفسی و .....هتد**

**ئەو یاسایەی کە سەرجەم میللەتانی دونیا لەسەری کۆکن ( یەکگرتن بەهێز بونەو جیاوازی لاواز بونە).**

**ئەوەچارەسەرە قورئانی و نەبەویەکان بو بۆ چۆنیەتی دروست کردنی برایەتی و توندوتۆڵ کردنی و پاراستنی .**

## هۆکارەکانی تەفرەقەو ئیختیلاف و ناتەبایی لە دیندا

**پێش ئەوەی باس لە هۆکارەکانی بکەن ئەبێت ئەوە مان لە یاد نەچێت ،ئەو هۆکارانەی ئەمرۆ هەمان ئەو هۆکارانەی دوێنێ یە – هەمان ئەو هۆکارانەیە کە سەری یەهودی  لەوەوە دەرکرد وائەمرۆ تیایدان ، هەمان ئەو هۆکارانەیە کە سەری نەصارای لەوەوە دەرکرد وا ئەمرۆ تیایدان هەمان ئەو هۆکارانەیە کە سەری ئوممەتی (محمد صلى الله عليه وسلم ) لەم رۆژگارەوە دەرکردوە .**

**ئەم شیکارو تەحلیلەی ئێمە بەدوورە لەهەر تەحلیلێکی سیاسی وشک بەڵکو تەحلیلێکی قورئانی ونەبەوییە پشت بەستراوە بە ئایەت و حەدیسانەی لەمەر ئەم باسەوە دواون هەر بۆیە پشت بە خواو دوای داواکردنی کۆمەک و یارمەتی لەوەوە ئەڵێین :**

**یەکەم: هۆکاری کارێک لەو هۆکارانەی بۆتە مایەی ئیختیلاف و تەفرەق ، شەرم کردنە لە یەکتر.**

**خوای مەزن دەفەرموێ** :(وَمَا اخْتَلَفَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ إِلَّا مِنْ بَعْدِ مَا جَاءَهُمُ الْعِلْمُ بَغْيًا بَيْنَهُمم"( آل عمران19) (مما اخْتَلَفوا إِلَّا مِنْ بَعْدِ مَا جَاءَهُمُ الْعِلْمُ بَغْيًا بَيْنَهُمم) **ئەهلی کیتاب و غەیرە ئەوانیش هۆکاری ئەوەی جیاوازی کەوتە نێوانیانەوە زوڵم و ستەم کردن بوو لە یەکتری بەڵێ بەڕاستی خۆشەویستی زاڵ بون و دەسەڵات گرتنە دەست و زوڵم کردن لە یەکتر لە گەورەترین هۆکارەکانی جیاوازی و ناتەباییە ،هەر بۆیە رە سولی خوا (صلی الله علیه وسلم) لەمە ترساوەو ئاگاداری کردوینەتەوە ، وەک و دەفەرموێت (لا ترجعوا بعدي كفارا يضرب بعضكم رقاب بعض) لە بوخاری دایە قورئانیش چارەسەری ئەمەی بۆ داناوین :** (وَإِن طَائِفَتَانِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا فَإِن بَغَتْ إِحْدَاهُمَا عَلَى الْأُخْرَى فَقَاتِلُوا الَّتِي تَبْغِي حَتَّى تَفِيءَ إِلَى أَمْرِ اللَّهِ فَإِن فَاءتْ فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا بِالْعَدْلِ وَأَقْسِطُوا إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ) **(الحجرات/9) دەبینین فەرمان دەفەرمووێ بە عەدل و دادگەری کە دژی زوڵم و ستەمە . جا مێژوی کۆن و تازەشمان شاهێدی ئەم عللەتە قورئانییە ، تەنانەت لە کوردستانی خۆمان داو غەیرە کوردستانیش شاهێدی زیندومان هەیە کەوا ئیسلام پەرتەوازە بووە یەکێک لە هۆکارەکانی ستەم لە یەکتر کردن بوو .**

**دووەم: شوێن کەوتنی هەواو ئارەزوو هەنگاوەکانی شەیتان .**

**خوای مەزن دەفەرموێت** (أَفَرَأَيْتَ مَنِ اتَّخَذَ إِلَهَهُ هَوَاهُ وَأَضَلَّهُ اللَّهُ عَلَى عِلْمٍ) **(الجاثية/23)کەهەواو ئارەزو بو بە خوایەک و گوێرایەڵی کرا ، بە دڵنیاییەوە هۆکارێکی گەورەی ئیختیلاف و تەفرەقەیە.** ((وَأَنَّ هَذَا صِرَاطِي مُسْتَقِيمًا فَاتَّبِعُوهُ وَلاَ تَتَّبِعُواْ السُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَن سَبِيلِهِ))**(الأنعام/153) دەبینین خوای مەزن سبیلی خۆی بە مفرد دێنێ ،چونکە ڕێگای خوای مەزن هەر یەک ڕێگایە بەڵام ڕێگاکانی تر بە کۆ دێنێت چونکە زۆرن . جاتەماشای ئەم هاوکێشەیە بکە:**

**سبیلی خوا = تاکە= اجتماع و کۆکی و کۆبونەوە**
**سوبولەکانی تر= کۆیە = تفرق و جیاجیایی و ئیختیلاف**
**ئەگەر ڕێگاکانی شەیتان بێت هەر زۆرە ، ئەگەر ڕێگاکانی نەفس و هەواو ئارەزو بێت هەر زۆر و کۆیە .**
**(ئەبو عالیەش بەرەحمەت بێت )دەفەرموێت : (إیاکم و هذه الأهواء التی تلقي بین الناس العداوة والبغضاء ) ئامان وریای هەواو ئارەزوبن ، بەراستی دوژمنایەتی و ڕقەبەرایەتی دەخاتە نێوان خەڵکەوە.. هەروەها ئیبن موبارەک – رحمه الله – دەڵی :**
**( وهل أفسد الدین إلی الحلوک        وأحبارو سوء ورهبانها ).**
**خۆی لە راستیدا علم و عصمەت و پارێزە لە ئیختلاف و فیتنە بەڵام هەواو ئارەزووو ولێ تێکدەدا** {وَاتْلُ عَلَيْهِم نَبَأَ الَّذِي آتَيْنَاهُ آيَاتِنَا فَانْسَلَخَ مِنْهَا فَأَتْبَعَهُ الشَّيْطَانُ فَكَانَ مِنَ الغَاوِينَ، وَلَوْ شِئْنَا لَرَفَعْنَاهُ بِهَا وَلَكِنَّهُ أَخْلَدَ إِلى الأَرْضِ وَاتَّبَعَ هَوَاهُ، فَمَثَلُهُ كَمَثَلِ الكَلْبِ إِنْ تَحْمِلْ عَلَيْهِ يَلْهَثْ أَوْ تَتْرُكْهُ يَلْهَث ذَّلِكَ مَثَلُ القَوْمِ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِآياتِنَا فَاقْصُصِ القَصَصَ لَعَلَّهُم يَتَفَكَّرُونَ سَاءَ مَثَلاً القَوْمُ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِآياتِنَا وَأَنْفُسَهُمْ كَانُوا يَظْلِمُونَ **} [الأعراف/175–176–177]. مفسیرین باسی ئەوە دەکەن کەلەسەر پیاوێکی بەنی ئیسرائیلی دابەزیوە کەناوی سلجام بوە،شتی زۆریشی دەگێڕێتەوە لەبارەی فراوانی زانستی یەوە بەڵام (اتبع هواء)جاعیلم خۆی تەبایی تێدایە بەڵام هەواو ئارەزوو تێکی دەدات لێی_نعوذ بالله من علما والسوء.**
**خوای مەزنیش بەڕاشکاوانە لە قورئان دا پێمان رادەگەیەنێت کەوا:(** إِنَّمَا يُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَن يُوقِعَ بَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةَ وَالْبَغْضَاءِ...**)(المائدة/91) شەیتان ،ئاواتی ئامانجی ،هیوای دووبەرەکی خستە نێو موسڵمانەوە ،پەیامبەری خواش دەفەرموێ _ هەروەک لەموسلیم دا هاتوە لەحەدیسەکەی جابر :( إن الشیطان قدیئس أن یعبده المصلون الکن في التحریش بینهم)**
**سێ یەم: شوێنکەوتنی هاو شێوەکانی قورئان و وازهێنان لە حوکمەکانی. بەڕاستی هەرچی حیزب و گروپ و کۆمەڵ و لایەن هەیە ،هەمووی**

**بەڵگەی خۆیان هەیە،چ لەقورئان چ لەحەدیسەکانی پەیامبەری خودا (صلی الله علەوسلم ) وادەزانێت ئەو ئایەت و حەدیسانە لەسەر ئەوان وتراوە، بەرگری و پشت گیرییە لە بیرۆکەو بیروو بۆ چونەکانی ئەوان .بەراستی خوای مەزن ئاگادارو وریای کردوینەتەوە لەشوێن کەوتنی متشابهاتی قورئان و پێمان رادەگەیەنێت ئەوانەی شوێنی متشابهات دەکەون دڵ نەخۆشەکانن ،وەک لەسورەتی ال عمران دا خوای گەورە دەفەرموێت**(فَأَمَّا الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَابَهَ مِنْهُ ابْتِغَاءَ الْفِتْنَةِ )(ال عمران/ 7)

**بۆ ئاژاوە گێری و دووبەرەکی نانەوە** - وابْتِغَاءَ الْفِتْنَةِ ،**بەمەبەستی چیا کردنەوە** (وَمَا يَعْلَمُ تَأْوِيلَهُ إِلاَّ اللّهُ وَالرَّاسِخُونَ فِي الْعِلْمِ يَقُولُونَ آمَنَّا بِهِ كُلٌّ مِّنْ عِندِ رَبِّنَا)**(ال عمران7)**

**جا ڕێگەو ریبازی ئەهلی حەق –کەئەهلی سوننەوجەماعەن –باوەر بوونە بە متشابهەکان تەفسیر کردنێتی بە مەحکەمەکان .**

**چوارەم:(هۆکارێکی تریش کەهەر دەتوانین لەژێر ئەم خاڵە دا جێی بکەینەوە):شوێن کەوتنی ئە لفاظی هاوبەش محتمل و مجمل ،کەزۆربەی ئیختیلاف وتەفرەقەکان ئەمە هۆکار بووە ، هەر لە خەواریجەوە دەست پێ بکە کەدروشمیان (إن الحکم إلا لله)بوو ئەمەش حەقەو مجملە ،لەتەفصیلەکەی دا تێ کەوتبون ،پاشان شیعەو مورجیئەو ....هتد، هەمووی چەند دەقێکی مجملی هێناوە ،بەرانبەرەکەی پێ تاوان بار کردوە.**

**پێنجەم: نەزانین و جەهل و ناشارەزایی :**

**بێگومان ریگای تەبابون لەزانیندایەریگای ناکۆکیش لەنەزانین دایە.**

**هەروەک سفیانی ثەوری دەفەرموێ (لعالم واحد أشد علی الشیطان فی مائة عابد) تەنها زانایەک قورسای لە سەت عابدو خوا پەرست زۆر ترە لەسەر شیطان بەڵکو لەقورئان دا خوای مەزن رێنمونیمان دەکات کەوا هەموو هەواڵێک بڵاو نەکەینەوە ،نەوەک ببێتە هۆی فیتنەو ئاژاوەو ناکۆکی هەتا پیشانی ئەهلی خۆی و شارەزاییان دەدرێت و پرسیان پێ دەکرێت**(وَلَوْ رَدُّوهُ إِلَى الرَّسُولِ وَإِلَى أُولِي الأَمْرِ مِنْهُمْ لَعَلِمَهُ الَّذِينَ يَسْتَنْبِطُونَهُ مِنْهُمْ)

(النساء: 83) بەڵێ ،بەڕاستی ئەگەر نەزانین نەبوایە بەرانبەر بە قورئان و سوننەت ،ئەو هەموو خراپەیە ئێستا بونی نەبوو، نەلەعەقیدە،نە لەعیبادەت ،نەلەسلوک،نەلەسیاسەت،نەلەهیچ بوارێک لەبوارەکان دا .ئەوەتا خۆشەویستی خوا بەوپەڕی راشکاوی یەوە پێمان رادەگەیەنێت کەوا دەست گرتن بەقورئان و سوننەتەوە نەجاتە ، نەزانین پێی و دوورکەوتنەوە لێی دوبەرەکی و هەلاکەتە وەک لەمستدرکی حاکم دا هاتوە بەسەنەدێکی حسن (ترکت فیکم أمرین لن تضلواماإن تمسکتم بهما، کتاب الله وسنتی ،ولن یتفرقا حتی یردا علي الحوض) وەک ئەوەی بڵێ شارەزابن لە و دینە، لەو دوو چاوگە رەسەنە ،تفرقە ڕووتان تێ ناکات تالە حەوزی کەوثەر پێم دەگەنەوە.

شەشەم: شتی تازە هاوردنە نێو دینەوە کە خوا شەرعی نەکردوە:

خوا دەفەرموێ (أَمْ لَهُمْ شُرَكَاء شَرَعُوا لَهُم مِّنَ الدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَن بِهِ اللَّهُ)(شورا 21)، پەیامبەریش دەفەرموێ :هەروەک لەصەحیحەیندا هاتوە لەحەدیسەکەی عائیشە(من أحدث فی امرنا هذا مالیس منه فهو رد) لەریوایەتێک دا (من عمل عملا لیس علیه أمرنا فهو رد) هەروەها بە صحیحی هاتوە فەرمویەتی (کل محدثه بدعة وکل بدعة ضلالة وکل ضلالة فی النار)جا ئەوکەسەی تەماشای زۆربەی ئەو دووبەرەکی و جیا بونەوانەی نێو ئوممەتی محمد دەکات ،دەزانێت لەم جۆرەیە ،خەڵکانێک بیدعەیەکییان بۆخۆیان هێناوەتە کایەوە، پاشان خەڵکێکی تریش داویانەتە پاڵیان ،ئیتر فیرقەیەکی نوێیان بۆخۆیان دروست کردوەو برینێکی تریان خستۆتە نێو لاشەی ئەم ئوممەتەوە ، ئەمانەش وەک و ئەشعەرێکان و قادیانی و بەهائی و موعتەزیلەکان ،

حەوتەم: زیادە رۆیی کردن (الغلو والطغیان).

سوێند بەخوا فیتنەی زیادە رۆیی کردن ،یەکێکە لەگەورەترین ئەو فیتنانە کە مرۆڤایەتی پێوە گیرۆدە بوو. خوای مەزن دەفەرموێ (فَاسْتَقِمْ كَمَا أُمِرْتَ وَمَنْ تَابَ مَعَكَ وَلاَ تَطْغَوْا) هەروەها دەفەرموێ:( يَا أَهْلَ الْكِتَابِ لا تَغْلُوا فِي دِينِكُمْ) پەیامبەریش (صلی الله علیه وسلم دەفەرموێ(إیاکم والغلو فإنما

**أهلك من كان قبلكم الغلو فى الدين ) .**

**هەشتەم: شوێنکەوتنی ئەهلی کیتاب و لادان لە مەنهەج و ڕێبازی هاوەڵان و شوێن کەوتوان :**

**لەسەنەدی ترمذی دا هاتوە لە حەدیسەکەی أبو هورەیرە بەسەنەدێکی حسن (لتتبعن سنن من كان قبلكم شبرا بشبروذراعا بذراع،ولو دخلو حجر ضب لدخلتموه) لە ریوایەتەکەی إبن عمر دا (وإن بني إسرائيل تفرقوا على إثنتين و سبعين ملة ،وإن أمتي ستفترق على ثلاث و سبعين ملة، كلها فى النار إلى واحدة ،قيل : ماهي رسول لله ؟ قال ما أنا عليه اليوم وأصحابي)**

**لەم فەرمودەیەدا دووسود وەردەگرین :**

**1ـ شوێن کەوتنی ئەهلی کیتاب لاشەی ئەم ئوممەتە پەرتەوازە دەکات و بەرەو گومڕاییان دەبات ، دەبینی دوای ئەوەی باسی شوێن کەوتنی ئەوان دەکات باسی تەفرەقەیان دەکات .**

**2 ـ چارەسەری تەفرەقەو ئیختیلاف و ناکۆکی و پشێوی ، شوێن کەوتنی (ماأنا عليه اليوم و أصحابي )ە .**

**خاڵێکی تر کە هەر تابعە بەمەوە : شوێنکەوتنی سەقافەت و بۆچونی کافران و خاوەن دینەکان : بەگواستنەوەی بۆ نێو وڵاتی موسڵمانان ، لە ڕێگەی کتێب و گۆڤار و تەلەفزێون و ڕاگەیاندنەکانەوە بە گشتی ، کە ئەم کارە هەر علمانیەکان پێی هەڵنەساون بەڵکو خەڵکی تریش لە میللەتی ئیسلام پێی هەستاون . لە کۆتاییەکانی سەردەمی بەنی ئومەوی بوو ئەم کارە شوومە دەستی پێکرد وەکاتێک خالیدی کوری یەزیدی کوری معاویە نوسراوی فەیلە سوفە یۆنانیەکانی هێناوە بە مەبەستی وەرگێرانی ، چونکە لێوەی دەگێڕنەوە کە زۆر هۆگرو شەیدای ئەونوسراوانە بوو ئیتر لە وەودووا هەربەردەوام ئەنجام دەدرا تاسەردەمی مەئمون و وە لەوەو دواش ئا سەواری خراپە بە شێوەیەک کەوتوە ، کە هەرکەس چاوی هەبێ و ببینێ دەزانێ ئیسلام چ زەرەرو زیانێکی لێکەوت. کە چ عاملێکی کاریگەربووە بۆ پەرتەوازەکردن و**

**جوداکردنی ئوممەتی ئیسلام، کە هەتا ئەمرۆش ئاسەواری دیارە. تەماشای مەنهەجی قوتابخانەو خوێندنگا و پەیمانگاوو زانکۆکان بکە بزانە بابەتی ئاین چی تێدایە ،چەند کرچ و کاڵە ،تەنانەت زۆرێک دەبینی خەریجەو خوێندنی تەواو کردوە ،بەلام ئەفسوس زانیارییەکی ئەوتۆی لەبارەی ئاینەکەی خۆی یەوە نیە .خۆبابەتەکانی تر چەند ئامانجی خراپیان لە خۆ گرتوە مە پرسە ،دەرئەنجامی شوێنکەوتنی ئەوانە.**

**هۆکاری تریش هەبوون :- لەوانە:-**

**1- بانگەشەی قەومیەت ونەتەوە پەرستی .**

**2- موعجیب بون وتعصب بون و باوەڕبون بەرەئی خود.**

**3- استعمار کەبەراستی ئاسەواری وەک خۆر دیارە.**

**4- دروست بونی دەیان حیزب و کۆمەڵ و فیرقە ،کە هەریەکەی بانگەشەی ئیسلامی رەسەن دەکات ،هەریەکەشیان مەنهەجیان لەوەکەی تر جیاوازە.**

**تەنانەت وای لێهاتوە ،راستیەکان هەڵ گەراونەتەوە ،تێگەیشتنەکان پێچەوانە بونەتەوە ،تاکی موسڵمان سەرگەردان ماوە ، چۆن رزگاری بێت ، لەنێو ئەم هەموو حیزب و جەماعەتە جودا جودایانە گیرم کردوە ،هەرهەموشی بانگەشەی ئەوە بۆ خۆی دەکات کە لەسەر رێبازی راستیە؟! ئەویش لەخۆی دەپرسێت :- ئەگەر هەموویان راستن بۆ هەموویان نابنە یەکێک !!؟**

**وکل یدعی وصلا بلیلی          ولیلی لاتقی لهم بذاک**

**5- تقلیدی کوێرانە : کاریگەری ئەم خاڵەش زۆر ڕون و ئاشکرایە.**

**خوای مەزن دەفەرموی** (وَقَالُوا لَوْ شَاءَ الرَّحْمَٰنُ مَا عَبَدْنَاهُم مَّا لَهُم بِذَٰلِكَ مِنْ عِلْمٍ إِنْ هُمْ إِلَّا يَخْرُصُونَ ()أَمْ آتَيْنَاهُمْ كِتَابًا مِّن قَبْلِهِ فَهُم بِهِ مُسْتَمْسِكُونَ ()بَلْ قَالُوا إِنَّا وَجَدْنَا آبَاءَنَا عَلَىٰ أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَىٰ آثَارِهِم مُّهْتَدُونَ) **(الزخرف/20 -22)**

**بەڵێ بەراستی دەبێ ئەوە بزانین ئەو لاوازییەی ئەمڕۆ جیهانی ئیسلامی گرتۆتەوە دەرئەنجامی پەرتەوازیی و ناکۆکی و دوبەرەکی نێو رۆڵەکانی**

**یەتی کە ئەمەش دەرئەنجامی دوور کەوتنەوەی رۆڵەکانیەتی لە قورئان و مەعصوم و سوننەتی پیرۆز.**

**خوای مەزن دەفەرمێ** (وَلَا تَنَازَعُوا فَتَفْشَلُوا وَتَذْهَبَ رِيحُكُمْ) **کەواتە بۆ لاوازین و کەس حسابمان بۆ ناکات و فەشەلمان هێناوەو هێزو قووەتمان نەماوە ، وەڵامەکە لە فەرمایشتەکەی پەروەردگاری مەزنە :ـ نزاع = فەشەل و ذهابي ریحی لێ دەکەوێتەوە کە قوەت و هێزە .**

**تەنانەت لە ئایەتێکی تردا ئەوەمان بۆ رون دەکاتەوە کە تەفرەقەی نێو ئوممەت و جیا جیای کارەساتێکی کۆمەڵایەتی کاول کەرو لە ناوبەرە . مەترسیەکەی هیچی لە مەترسی کارەساتە گەردونیەکان کەمتر نییە** (قُلْ هُوَ الْقَادِرُ عَلَى أَنْ يَبْعَثَ عَلَيْكُمْ عَذَاباً مِنْ فَوْقِكُمْ أَوْ مِنْ تَحْتِ أَرْجُلِكُمْ أَوْ يَلْبِسَكُمْ شِيَعاً وَيُذِيقَ بَعْضَكُمْ بَأْسَ بَعْضٍ)**(الأنعام – 65) ئەوەتا دەبینین سزای پارچە پارچەکردنی ئوممەت بەراورد دەکات لەگەڵ کارەساتە گەردونیەکان و کاول کارەکان وەک سوتاندن و خنکاندن. هەروەها لە صحیحی مسلمدا هاتوە پەیامبەر صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت( إن الله زوی لی الأرض )ـ یان بۆی کۆکردمەوە ـ فرأیت مشارقها و مغاربها ، وإن أمتي سیبلغ ملکها مازوی لی منها .... و إنی سألت ربي أن لا یملکها بسنة عامه ـ بە وشکە ساڵی و قات و قری گشتی ـ ، وأن لا یسلط علیهم عدوا من سوی أنفسهم فیستبیح بیضتهم ، ولو اجتمع علیهم من بأقطارها ـ حتی یکون بعضهم یملک بعضا ویسبي بعضهم بعضا) .**

**ئەم فەرمایشتە ئەوەمان پێ دەبەخشێت ؟ کەوا ئەم ئوممەتی ئیسلامە هەمیشە بە هێزو دەسەڵاتە هەتا کۆک بن لە گەڵ یەک و دەست بگرن بە حبلی نەبچڕاوی خوای مەزننەوە . ئەوەمان پێ دەبەخشێت : درەختی ئیسلام هیچ هێزێک لە بنی ناهێنێت ئەوەشی لاوازی دەکات کرمەکانی نێو خۆین . ئەوەمان پێ دەڵێت : ئەوەی تەفرەقەی نێو خۆی دەتوانێت بیکات تۆپ و دەبابەو ناپاڵمی دوژمنی دەرەکی ناتوانێت بیکات. بەڵام لە بیریشمان نەچێت بێگومان ، بێ دودڵی ، تەفرەقەو ئیختیلاف دەرئەنجامێکی حەتمی و حاشا هەڵنەگرە لە بۆ دووری خەڵک لە تطبیق**

کردنی شەرعییەتەکەی خوای مەزن ، دەرئەنجامی ئەوەیە نەفس و شەیتان و هەواو ئارەزوو دەیان جوڵێنێت نەک شەریعەتەکەی پەروەردگار ، چونکە پیادەکردنی ئیسلامی رەسەن مرۆڤ بەرەو هەڵدێرو تەفرەقە نابات ، ئەوە شەیتان و نەفس و هەواو ئارەزووە ...

دەی هاوار .. هاوار... ئەی ئوممەتی محمد صلی الله علیه وسلم برایەتی بپارێزن دەست بگرن بە حبلی نەبچڕاوی خواوە ، لە دەوری عەقیدەو مەنهەج و دینەکەی کۆببنەوە نە لە سەر هیچ تەصەورێکی تر ، نە لەژێر هیچ ئالآیەکی ترا؟.

**ماوەتەوەبلێم**:

کەباسی یەک ریزی و تەبایی نێوان موسڵمانان دەکرێت دەبێت هەمیشە لایەنی عەقیدەمان لە بیر نەچێت ،چونکە عاملی یەکەم و جێی تەرکیزی سەرەکی ،کە کۆمەڵگای ئیسلامی لەسەر بنیاد ئەنرێت بەبنیادێکی دروستەوەبەبێ ترس لە داڕوخان ـ، عەقیدەیە. لە ژێر ئالآی عەقیدەدا ڕیزەکانیان بۆ هەمیشە یەک دەبێت ،ئەبێت بە تیشکی ڕووناکی عەقیدە ڕێگا ببڕێت بەرەو لوتکەکانی سەربەرزی و شکۆ مەندی ، بە عەقیدەی سەلەف فەتحی دڵان دەکرێت پێش شارو وولآتان . ئێمە لە ساحەکەدا چ لەسەر ئاستی ناوچەکە بێت چ لەسەر ئاستی جیهان بە گشتی زۆرێک دەبینین هەوڵی یەک ریزی دەدەن ، چ لە ڕێگەی محاضەرات و ووتار و ئامۆژگاری و کتێب و گۆڤار و رۆژنامەکانەوە بێت یان لە ڕێگەی کۆبونەوەو کۆنگرەو سیمینارەوە بێت ، هەڵبەت چارەسەری زۆرو باشیش دەخەنە روو ، بەڵام زۆربەی ناتەواوەو کەم و کورتی تێدایە ، چونکە زۆرتر بایەخ بە لایەنە فەرعیەکان دەدات ، بۆ نموونە بۆ هەندێک لەوانە لایەنە سیاسیە کەوە هەڵی خۆیان بە گەڕ دەخەن ، هەندێکی تر زیاتر بایەخ بەلایەنی ئەخلاقی و سلۆکی دەدەن ، هەندێکی تریش لایەنی زوهرو تەقواو دونیا نەویستی بایەخ پێ دەدات ....

کەمێک دەبینین لەم نێوەندەدا بایەخ بە لایەنە سەرەکیەکە ،بە کۆڵەکەی پرسەکە ،بدەن کە بریتیە لە عەقیدەی تەوحید ، کە بەهۆیە خوای مەزن

**دوای تەفرەقە کۆی کردینەوە ، بە هۆیەوە کردنی بە براو تەبا ،بوین بە خاوەن یەک ئوممەت ،یەک ئامانج ، یەک عەقیدە ، کە سەرچاوەی سەربەرزی و ناونیشانی کامەرانیمانە ، بەڵکو بونی وجودمانە ،لەم ژیانە** (وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنْسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ) **واتە : إلا ليوحدون .**

**کاتێکیش باسی جەخت کردنەوە دەکەین لەسەر ئەم لایەنە ،ئەوە نەبێت لایەنەکانی تر وەلابنرێت و بایەخیان پێ نەدرێت . مەبەست ئەوەیە لە ئەساسەوە دەست پێ بکرێت ولەم بنچینەوە کارەکان شروع بکەین. سوێند بەخوا هەر بانگەوازێک بەرز بکرێتەوە بۆ یەک ڕیزی و برایەتی ئیسلامی لەمەوە سەرچاوە نەگرێت و لەمەوە بونیاد نەدرێت و بەمەشەوە نەرۆین بۆ قۆناغەکانی تر ، لەسەر بنەمای جێ بەجێ کردنی تەوحیدو دورکەوتنەوە لە شیرک ، پاک سازی لە بیدعەو خورافات چاک سازی لە مەعاصی بنیاد نەنرێت سەر ئەنجامی فەشەل و دۆڕانە ، ئەگەریش بە ڕوکەش تەبابن ، لە ناخەوە هەر جودان** ((تَحْسَبُهُمْ جَمِيعًا وَقُلُوبُهُمْ شَتَّى)) **چونکە بنیاد نانە لە هەوادا ، بیناش لە زەویەکی توندو تۆڵ و ڕەقدا دروست دەکرێت بۆ ئەوەی توشی داڕمان و ڕوخان نەیەت .**

**داواکارم لە خوای مەزن هەمووومان لەدەوری قورئان و سوننەت کۆبکاتەوە ، برایەتی و تەبایی لە نێوانمان دا بە هێز بکات ، هەمووومان بگێرێتەوە سەر ڕاستە ڕێگای ئیسلامەتی ،حەقمان پیشان بدا و بمان کاتە شوێن کەوتەی ، ناحەقیشمان پشان بداو لێمان بە دور بگرێ ئەوەمان فێر بکات سودمان پێ دەگەیەنێت ، سودمان پێ بگەیەنێت بەوەی کە فێرمان دەکات .**

**سبحان ربک رب العزة عما یصفون وسلام علی المرسلین والحمدو لله رب العالمین .**

### سەرچاوەکان


**1ـ أثر العقيدة الإسلاميه في تضامن ووحدة الأمه الاسلاميه.د أحمد سعد الغامدي.**

**2– منهج السلف في العقيدة و أثره في وحدة المسلمين.د. صالح سعد**

السحيمى.

3- الإسلام يسد منا فذ الفرقه الاختلاف ولجون عوامل الوحدة والأئتلاف .د. جمعه على الخولى.

4- مرتكزات التضامن والوحدة .الشيخ عطية محمد صالح.

5- أسباب الاختلاف في الدين ،أسبابه وأحكامه.د .إبراهيم محمد بن عبدالله البريكان.

لەگەڵ چەند سەرچاوەیەکی تردا..

---

## پێنجەم: بەڕێز مامۆستاصاڵحی باغ وبەرە مامۆستاوکەسایەتی ناوداری شاری کەلار

**بەڕای بەندە هۆکاری پەرتەوازەیی:**

پەرتەوازەیی موسڵمانان لەهەر ساتێک دا بێت و لەهەر جێگەیەک دەگۆڕێت واتە لەجێگەیەک لەوانەیە مەرجەعێک هەبێت بەڵام بێ متمانەی موسڵمانان کەبەهۆکاری دەرەکی دروست دەبێت وادەکات کە پەرتەوازەی لەڕاو بۆچون لە مەواقف و هەڵویست لەپابەند بون بە پرنسیپە گشتیەکانی ئیسلام ئەو متمانە پێویستە نەبینێت وە هەندێ جار نەبونی مەرجەعێتی ئیسلامی رۆڵی کاریگەری دەبێت لە درووست بونی ئەو شپرزی و پەرتەوازەییە.

ئەو کات وای لێ دێت کەهەر گرووپ و کۆمەڵێک خۆی بەدروستترو ڕاست تر بزانێت و بەرانبەر سفرکات وە ئەمەش رەنگ دانەوەی خراپی دەبێت لەسەر رای گشتی موسڵمانان وە دەبێتە مایەی جۆرێک لەشیرازەی و نەدۆزینەوەی راستیەکان لەلای زۆرینەی خەڵک خۆ ئەگەر بێت و ئیسلام و مەنهەجەکەی بکرێت بە مەرجەع و شتەکان بگەڕێندرێتەوە بۆ سەرچاوە سەرەکیەکە ئەوا چارەسەر دەبێت وەک خوای گەورە دەفەرموێت(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ أَطِيعُواْ اللّهَ وَأَطِيعُواْ الرَّسُولَ وَأُوْلِي الأَمْرِ مِنكُمْ فَإِن تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللّهِ وَالرَّسُولِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ ذَلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلاً ) **(نساء 59)**

## شەشەم: بەڕێز مامۆستا شەهاب مامۆستاو بانگخواز

بسم الله الرحمن الرحيم

**نەگەڕاندنەوەی کارەکان بۆلای قورئان و سوننەت**

بۆنموونە قورئانی پیرۆز دەفەرموێت: ئیمان داران بران ئاشتەوایی بکەن لەبەینیان دا یەکتر بەکەم مەزانن،رێزلەبیروبۆچونی یەکتری بگرن ئەبینن لەڕۆژگاری ئەم رۆمان دا موسڵمانان چەندجیاوازن ،{ئیسلام ئەکاتە قوربانی فیکرەکەی خۆی ئەمە پێچە وانەی قورئانە. فەرمودەی پێغە مبەر{صلی الله علیه وسلم} دەفەرموێت:( **مثل المؤمنين في. توادهم وتراحمهم كمثل الجسد. الواحد إذا اشتكى منه عضو. تداعى له سائر الجسد بالسهر. والحمى)** مسلم.

ئەمرۆش موسوڵمانان پێچەوانەی ئەم فەرمودەیەن بۆنموونە ئەو برایانەی کە ناویان لە خۆیان ناوە سەلەفی چەند جیاوازن ئەوەی لەگەڵ خۆیان نەبێت کافرە.

---

## حەوتەم: بەڕێز مامۆستا عبدالله پێش نویژو ووتار خوێن لە مزگەوتی نبي إبراهيم لەگەڕەکی گازینۆ

الحمد لله رب العالمين والعاقبة للمتقين والندامة على الكافرين والمذنيين و أشهد ان لااله إلاالله ولي الصالحين وناصر الستضعفين وكاسر الجبارين والمتكبرين وأشهد ان نبينا وحبيبنا وعظيمنا وإمامنا محمد عبدالله ورسوله صلوات ربي وسلامه عليه وعلى زوجاته الطاهرات أمهات المؤمنين وعلى أل بيته الطاهرين وصحابته العز المعززين والتابعين لهم بإحسان الى يوم الدين.

**یەکەم/ نەبونی پێشەوایەک کەبتوانێ تەواوی موسڵمانان کۆبکاتەوە.وچونکە خوای گەورەدەفەرموێت**(وَاعْتَصِمُوا بِحَبْلِ اللَّهِ جَمِيعًا وَلَا تَفَرَّقُوا)
(ال عمران– 103)**خوای گەورە خیطاب دەکالەگەڵ پێشەوای مسوڵمانان دوای ئەوە هەموبەشەرێک کە کۆببنەوەوببنەیەک یەک جەستەویەک گیان وەهەمووماں کۆببینەوەلەسەر ئەونامەیە کەخوای گەورەبۆئێمەی ناردووە.وەپێغەمبەری خۆشەویست:**
(صلى اللهعليهوسلم)لەصحیحی، مسلم(عبداللهبن عمر)فەرمووی (رسول الله) (صلى اللهعليهوسلم) موسڵمانانی کۆکردەوە لە مزگەوت فەرمووی
**(إنه لم يكن نبي قبلي إلا كان عليه أن يدل أمته على خير ما يعلمه لهم، وينذرهم شر ما يعلمه لهم،.....) پێغەمبەران بەزەیی بوون بۆ بەشەریەت دیارە ئەو رۆژە کە رسول الله لە نێو یارە بەرزو بەقیمەتەکان دا بووە فەرموویە ئەبینم فیتنە دەبارێ وەک و دەنگی باران ئەی ئەو رۆ فیتنەکە چەندێک بەتین تر بێت ئەوەتە (سەحابی بەرێزوو دڵسۆز(حوزەیفەی کوری یەمانی)دەفەرمووێ خەڵکی پرسیاریان دەکرد لە رسول الله لە خێرەکان(وكنت أسأله له عن الشر مخافة أن يدركني) بڕوانە بۆ زیرەکی ئەو یاوەرە بەهێزو بەتوانایە گوتم قوربان ئێمە پێش ئیسلام لە ژیانێکی خراپ دا بوین بەڵام بە هۆی ئیسلامەوە کەوتینە ژیانێکی خۆش و پر خێر ئایە دوای ئەم خێرە شەر هەیە؟(فهل بعد هذا**

**الخير من شر)قال(نعم)وقال حذيفة هل بعد ذلك الشر من خير(فقال نعم وفيه دخن ) ليس خيرا صافيا)(قلت وما دخنه)قال نعم يهدون بغير هدي تعرف منهم وتنكر** )دەفەرمووێ کۆتایی گوتم یارسول الله ئەگەر من کەوتمە ئەو کاتە چی بکەم یەعنی موسڵمانانی ئەورۆ چی بکەن ئە ئاوا فیتنە ئەوەندە زۆر بوە ئازیزمان فەرمووی بەیانی بەئیمانەوە دەردەچێ ئێوارە بەبێ ئیمان دەگەرێتەوە وە ئێوارە ئیمان دارە بەیانی بەبێ باوەر دەر دەچێ جارسول الله فەرمووی بەیاوەری خۆشە ویست حزیفە (فقال (صلی الله علیه وسلام ):(**تلزم جماعة المسلمين وإمامهم** )برِوانە خوێنەری بەهێزو بەپێز یەکەم رسول الله فەرمووی کۆی موسڵمانان دووهەم فەرمووی پێشەوایەک لەو کۆیە موسڵمانانە یەعنی ئەورۆ سوپاس بۆ خوا موسڵمانان هەن بەڵام پێویستیمان بە پێشەوایەکی زۆر ئیخڵاس هەیە بۆ کاری موسڵمانان کۆشش بکات نەک بۆ رازی کردنی ئەم و ئەو وەخەڵکی بانگ کات بۆ لای خوا نەک بۆلای حیزبەکەی یان بۆ لای بۆچونەکەیان دیارە ئەورۆ موسڵمانان زۆرن وەک و دڵسۆزمان پێشەواو خۆشەویستمان محمد المصطفی (صلی الله علیه وسلم)فەرمووی(**كغثاء السيل** )بەڵام نەخۆشیەکە لەوەدایە کە پێشەوایەکی ئەوتۆ نیە کە بتوانێ موسڵمانانی هەموو جیهان کۆ بکاتەوە وە داواکارین خوای گەورە چی زوتر ئەو پێشەوایە بنێرێ بۆ موسڵمانان کە بتوانێ هەمومان کۆ بکاتەوە وەک و هەواڵی داوە راستگۆ محمد المصطفی (صلی الله علیه وسلام) ئەویش (**محمد ناوی لەنەوەی فاطمە کەناسراوە بە(مهدی) کەئەو دەتوانێ موسڵمانان کۆبکاتەوە** !.

**دووەم/** نەبونی وووریای تاکی موسڵمان ، چونکە پێویستە تاکەتاکی موسڵمانان زۆر ووریا بن چونکە رسول الله (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی لە صحیحی موسلیم دا حوزەیفەی یەمانی دەفەرمووێ رسول الله (صلی الله علیه وسلم) (**تعرض الفتن على القلوب كعرض الحصير عودا عودا ، )أي (فتنة فتنة) فأي قلب أشربها نكتت فيه نكتة سوداء ،** ) یاالله ئەوەتە دەورەکە هاتە سەر تاکە تاکی موسڵمانان لێرە ئەم موسڵمانە

خۆی ڕانەگرت لەسەر ئەم فیتنە شوێنەواری کەوتە سەر دڵی . وە بڕوانە بۆ سەر ئەم تاکە تاکە کە ئیتر رسول الله چی دەفەرموێ (صلى الله عليه وسلام)( **وأي قلب أنكرها نكتت فيه نكتة بيضاء، حتى تعود القلوب على قلبين: قلب أسود مربادا كالكوز مجخيا، لا يعرف معروفا و لا ينكر منكرا، إلا ما أشرب من هواه، و قلب أبيض فلا تضره فتنة ما دامت السماوات و الأرض**) دیارە لێرەدا ووریای موسڵمانان زۆر دەورێکی گرنگی هەیە ئەوە لەوێ ئەوەیان ڕۆژ لەدوای ڕۆژ دەچێتە سەر دڵی وە ئەم تاکە کەسەش زۆر وریایەو بەهێزە هەرچەند والەنێو لێژاوی فیتنەدا بەڵام ڕۆژ لەدوای ڕۆژ دڵی ساف دەبێ و ڕوناک دەبێ .

سێیەم/ رسول الله (صلى الله عليه وسلم )تاکۆتا هەناسەی ئومەتەکەی ئاگادار کردەوەو کەدوای خۆی قورئان و سوننەت لەبیر نەکەن ، خوای گەورە خۆی دەفەرمووێ(فَإِن تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ) وە لەلا ئەگەر کارەکانمان بگەڕاندایەتەوە بۆ (قورئان و سوننە) ڕۆژمان ئاوا تاریک نەدەبوو جاداواکارم هەموو کێشەکانمان بخەینەوە ژێر سێبەری قورئان و سوننە.

بڕوانە ئیمامی شافعی(خوای لێ رازی بێ)دەفەرمووێ: **ئەگەر کێشەت هەبوو لە چۆنێتی بەنی پێڵاوەکانت بگەرێرەوە بۆ قورئان و سوننە ئەوە کێشەکە چارەسەر دەبێ.**

داواکارین خوای گەورە هەموو لایەکمان لەسەر دینەکەی بژێنێ و وە لەسەر دینەکەی بمان مرێنێ(اللهم امین)

---

# ناوەڕۆک

| بابەت | لاپەڕە |
|---|---|

---

له كۆتاييدا : داواكارين لەخواى گەورە و ميهرەبان بە بەزەيى خۆى بەزەيى بێتەوە بەم زەليلى يەى كەبەسەر موسڵمانانى ئەمڕۆدا هاتوەو عيزەتمان پێ ببەخشێت و بمان كاتە پێويستى بۆ سەرخستنى دينەكەى،

ئەوەى كەماوە بيڵێم كە جێ ى ڕێزو دەست خۆشى و دوعاى خێرە بۆ هەموو ئەوكەسايەتى يە بەڕێزانە ى كە يارمەتييان دام لەم پەرتوكە دا وە سوپاسى ماندووبونى هەموو ئەو مامۆستاو بانگخوازو نوسەروخەم خۆرە دەكەين كە هاتن بەدەم بانگەوازە كەمانەوە وە داواى لێبوردنيش

لەو مامۆستاوبانگخوازە بەڕێزانە ش دەكەين كە بەجۆرێك دەستمان پێيان نەگەشت يان فريا نەكەوتن لێدوانەكانييانمان بۆ بنێرن هەڵبەتە پاش پەيوەندى كردنمان بە چەند مامۆستاوبانگخوازو چەند برايەكەوە لە چەند شوێنێكى وەک شارەكانى كەركوک و چەم چەماڵ و هەڵەبجەى

شەهيد و هەڵەبجەى تازە و چەند شاروشارۆچكەى ترى كوردستان ناوچەيەكى تر هەوڵمان دا بەڵام قەدەرى خواى گەورە هيچمان حاصڵ

نەكرد هيوامان وايە لانى كەم ئەم نوسينە ببێتە سەر لە نوێ زاخاوكردنەوەى دڵەكان بە قورئان و سوننەتى خواوپێغەمبەرەكەى(صلى الله عليه وسلم) وە ببێتە ڕاچلەكاندنێک بۆ ئەوكەسانەى كە ئاواتييان سەرخستنى لايەن و كەسايەتى خۆيانە و كەمێک بە خۆيان دا بچنەوەو هەموو پێكەوە لەهەوڵى سەرخستنى دينەكەمان دا بين(إن شاألله) چونكە ئەمڕۆ دوونيايەو سبەينێ قيامەت!؟.

وصلى الله على نبينا وحبيبنا محمد(صلى الله عليه وسلم)

وعلى اله وصحبه وسلم